


## کورد و زەردەشتیەکان

# تەواوی بەشەکان

# ئەنفالی کوردان لە ژێر سێبەری شمشێردا

بۆ زانیاری زیاتر یان هەر ڕەخنە و پێشنیارێک ئەتوانن پەیوەندی بکەن بە ناوەندی زەردەشتیانی کوردستان. سلێمانی- گەڕەکی بەختیاری خوار سەنتەری گەنجان بەرامبەر مەکتەبی سیاسی (ی.ن.ک).

٠٧٧٠٣٩٩٦٧١٥ - ٠٧٧٠٢١١٧٣٧٨

ئەنفالی کوردان لەژێر سێبەری شمشێردا.

بەشی یەکەم

زەردەشت. ك. مکایڵی

گێرانەوەیەکی مێژوویە کە باس لە هاتنی سوپای ئیسلام دەکات بۆ کوردستان هەول دەدەم بە چەند بە شێک دای بەزێنم بۆ ئەوەی خوێنەر تاقەتی خوێندنەوەی، هەبێت.
ئەبو تەبەری وا ئەم مێژوەمان بۆ دەگێرێتەوە:

هاتنی سوپاکەی عومەری کوری خەتاب و داگیرکردنی کوردستان ئەبو عبیدی جراح سەرکردەی سوپای ئیسلام بوو لە وولاتی شام و ئەرمەن و دەوروبەری موسڵ نامەیەک دەنوسێت بۆ عومەری کوری خەتاب لە نامەکەیدا پرسیار دەکات ئایابەرەورۆژهەڵات پرۆین یان ڕۆژئاوا نامەکە تەواودەکات دەی داتە دەست (عبدوڵلای کوری ئەنس)وشترێکی خۆش ڕەوی ئەداتێ عبدوڵلای کوری ئەنس دەڵێ شەو ڕۆژ بەڕێوە بوم دەمەو عەسر گەیشتمە مەدینە چومە سەر قەبری محەمەد دوورکعات نوێژم کرد دوایی چومە لای عومەری کوری خەتاب بینیم لەلای ڕاستی علی لەلای چەپی عوسمان دانیشتبوو لە چواردەوریان عەباسی کوری عبدالمتەلب و عبدرحمانی کوری عوف سعد کوری زەید تەلحەی کوری عبداڵله کۆمەڵێک لە یارانی محمەد عومەر نامەکەی لێوەرگرتم زۆر دڵ خۆش بووبەداگیرکردنی ئەو وولاتانە ودەست کەوتەکانی شەڕەکان (تالانی) عمر ڕوی کردە کۆمەڵەکەو ووتی چیبکەین عەلی ووتی نامەیەک بنوسە بۆئەمیری موسڵمانان لە شام کە خالیدی کوری وەلید بنێرێت بۆ داگیرکاری وولاتی کوردان،عمری کوری خەتاب دەڵێت خۆشم هەروام دانابو چونکە محمد ووتویەتی خالید شمشێری اڵلەیە ڕووبەڕوی دوژمن قەت شمشێر نانێ تە کێلان.

عبداڵله کوری ئەنەس دەڵێت ڕۆژی دوایی کەدەکاتە ڕۆژی پێنج شەمە(٢٠جمادی یەکەم بەرامبەر١٦کۆچی محمد) وەڵامی نامەکەم لە عومەر وەرگرت ئەمە نوسرابولە عومەری کوری خەتابەوە بۆ ئەمیری سوپای ئیسلام ئەبو عوبیدی جەراح لە شامو موسڵ سەلامو بەرەکەتی اڵلەتان لێبێت بەسەرکەوتنەکانتان دڵ شاد بوین ئێستا ئەسپەکانتان ئامادە بکەن بەرو وولاتی کوردان ٤٠٠٠٠ هەزار سەربازبدە بە خالیدی کوری وەلید دژی قەومی کورد بجەنگێن پێویستەئەم سەرکردانەش هاوکاری بکەن ١زوبیری کوری عوام٢فەزلی کوری عەباس٣مقداد اسود ٤عبدالرحمان٥کوری ئەبوبکری سدیق زراری ازور٦عبداڵلەعمری٧ ابو دوجانە ٨ئەیوبی انساری لە درێژە نامەکەدا دەڵێت بیستومە لە کوردستان چەند پاشایەکی بە هێز هەیە ١فروخ پاشا لە مەرگە٢پاشا ئەژدەر لەپشتدەر٣دانیکور پاشا لەدووگۆمان٤جاتلیس پاشا لە هەولێر هەروەها ئاگاداریان دەکاتەوە لە بەهێزترین پاشای کورد کە ئەویش فروخ پاشای کوری ئەهرانە ئەم پاشایە خاوەنی سەربازی زۆروقەڵای بەهێزە لەژێر نامەکەدا نوسیوێتی:

فاقتلوا المشرکین ولحمداڵله رب العالمین مۆری محمد ئەدا لەنامەکە.

عبداڵله انس دەڵێت بەنامەکەوە کەوتمە ڕێ کەگەشتمە سوپای ئیسلام نیوە ڕۆ بوونامەکەم دایە دەست اباعبید ئەویش سوپای ئیسلامی کۆکردەوە نامەکەی عمری بۆ خوێندنەوە خالیدو لەشکرەکەی هاواریان کرد ئێمە ئامادەین بۆ جەنگ پاش سێ ڕۆژ گەشتنە سنوری هەولێر لەوێ خێوەتیان هەڵدا.

تبینی(خالید کوری وەلید مرۆڤێکی داوێن پیس وڕندە بوە هەمووژیانی لەشەڕدا بردۆتە سەرشا رەزایەکی کەمی هەبوە لە دینی ئیسلام ،ئامانجی ئەو شەڕ کردن بوە لە پێناوی تاڵانی وکە نیزە بە دەست هێنان بوە).

سەرچاوە
واقیدی
ناوی موحەمەد کوری عومەری واقیدی یە لە ساڵی ١٣٠ کۆچی دا لە شاری مەککە لەدایک بوە لە بەغداد کۆچی دوایی کردوە زۆر کتێبی نوسیوە لە سەر داگیرکاریەکانی ئیسلام لە ئەسکندریە ئەرمەنستان و وولاتی بەینی ڕووبارو.وولاتی عەجەم وخۆراسان ووداگیر کردنی ئەفەریقا و داگیر کردنی زەویە بە پیتەکانی عێراق و شام. وجزیرە .داگیر کردنی کوردستان دەست نوسێکی واقیدی بوە بەناوی (فتوح سواد العراق) لەماڵی مەلا عەبدول سەمەد لە مەرگە تاکە نوسخەیە ،ئەو نوسخەیە یەک بەرگی لە سەر ئاگاداری شێخ ئەمین بێژەی لە بەری گیراوەتەوە دوای چەند نوسخەیەکی تریشی لەبەر گیراوەتەوە .دوایی محمد تەوەکولی داوا لە مەلا عەبدولعەزیزواعیزی سەردەشتی دەکات کە هەمووی لە عەرەبیەوە وەگێرێتە سەر فارسی ئێستا نوسخە ئەسڵیەکەی لای نەوەی شێخ محمد ئەمینە .عەبدولعەزیز واعیزی سەردەشتی (لە ساڵی١٨٩٥ لەکۆیە لەدایک بوە دوایی بۆ مەلایەتی چوە بۆ سەردەشت ٦٧ بڵاوکراوەی تری هەیە).

هەروەها مەلا ڕەووف سەلیم حوێزی هەمان دەست نووس ساڵی١٩٧٠ بە ناوی کوردستان وئاینی ئیسلام ی بڵاو کردەوە بە دوو بەش لەیەک کتێب دا بەشێکیان بە هۆنراوە بەشی دووەم گێرانەوەی ئەو مێژووە بە نوسین (کوردیەکی کۆن زمانی مەلا) بەڵام ئێستا نە لە کتێبخانەکان و نە لە بازاڕەکاندا دەست دەکەوێت لەوە دەچێت قەدەغە کرابێت
مەلا ڕەووف سەلیم حوێزی ١٩٠٨ لە کۆیە لەدایک بوە چەند بەرهەمێکی تری هەیە.

تێبینی: هەموو ڕۆژێک سەعات ٥ی ئێوارە بەکاتی کوردستان- هەولێر بەشی تازە بڵاوئەکەینەوە.

## ئەنفالی کوردان لەژێر سێبەری شمشێردا.

بەشی دووەم

لەشکرەکەی خالیدی کوری وەلید کە پێک هاتبوو ٤٠٠٠٠ هەزار سەربازلە نزیک قەڵای هەولێر خێوەتیان هەڵدا.من وای بە باش دەزانم پێش ئەوەی بچینە ناو باسەکەوە خالیدی کوری وەلید تان پێ بناسێنم. خالید کوری وەلید کێ یە با بزانین ئەو فریشتەیەی اللە یە کێ یە وا ئەو وولاتانەی ئەو بۆی چووە لە جوانی ڕەوشتی وبەرزی ڕەفتاری بەخشندەیی ئەم سەرکردەیە بێ دوودڵی بێ سڵەمینەوە وازیا ن لە ئاینی باوباپیرانیان هێناوە پۆل پۆل ها تونەتە ناو دینێکەوە نە لە زمانەکەی تێ دەگەن نە لە کلتورەکەیانەوە نزیکە نە لە دینەکەی خۆشیان باشترە بووە ئەبێ ئەونهێنیە چی بێ؟

خالید کوری وەلید لەمەککە لە دایک بووە لە ساڵی ٥٩٢ز وە لە ساڵی ٦٤٢زلەسوریا کۆچی دوای کردوە .خالید بەشداری زیاتر لە سەد جەنگ کردووە لە ناو ئەمانەدا جەنگی ئوحود وخەندە ق لە دژی موسڵمانان پێش ئیسلام بوونی. کە لە شەڕی ئوحودا حەمزەی کوری عەبدولموتەلیب کوژرا محمد بریندارکرا ،لەو شەڕەدا هێزکەی خالید توانی سەربکەوت بە سەر هێزی موسڵماناندا. پاشان جەنگی یەرموک و جەنگی موتە دژی ڕۆمەکان وجەنگی کورد جەنگی فیراز دژی فارسەکان کە تێیدا توانی سەرکەوتن بە دەست بێنێت. .لە ئایاری ساڵی

٦٢٩ز (ساڵی حەوتی کۆچی)خالید لە مەککەوە بەڕێکەو بۆ مەدینە. لە ڕێگادا چاوی بە عامری کوری عاس و عوسمانی کوری تەلحە کەوت، پێکەوە بەڕێکەوتن بۆ مەدینە و بوون بە موسڵمان،، واتە دوای سەرهەڵدانی ئیسلام بە بیست ساڵ، بووە بە موسڵمان، لە دوای موسڵمان بونی کۆمەڵێک کاری دڕندانەوخراپی کردوە ،جارێک محمەد خالیدی ناردی بۆ فەلەستین لە وێش بە بێ هیچ هۆیەک ٥٠٠مەسیحی سەرپری هاوەڵەکانی شکاتیان لێکرد لەلای محمەد ،محمەدیش پێی ووت نابوایە کارێکی لەو جۆرەت بکردایە دەڵێن خالیدی زۆر بە تورەیی وەڵامی دایەوە وتی من ئەوە دەکەم کە ئەمەوێت من خالیدم. خێڵی جذیمة موسڵمان کردو هەمووشیانی سەرپری دەستی لە بێتاوان و منداڵەکان نەپاراستووەو هەموویانی کوشتووە ،دەڵێن کاتێک محمد بەمەی زانی ڕوکردە اڵلە ووتی من ئەوکارەم پێ نەکرد خۆی کردی پێ یان ووت لەکارلای بە ووتی نا ئەو شمشێری هەڵکێشراوی اڵلەیە بەکاری دەهێنم لە دژی کافرەکان باش ترس دەخاتە دڵ یانەوە. خالید شەڕی هەڵگەڕاوەکانی بەفەرمانی ئەبو بکری سدیق کرد کە ووتی (وَاللَّهِ لَأُقَاتِلَنَّ مَنْ فَرَّقَ بَيْنَ الصَّلَاةِ وَالزَّكَاةِ.)ئە وەی زەکات نەدات دەبێت بکوژرێت لە بەر ئەوەی من جیاوازی نابینم لە نێوان نوێژ و زەکاتدا. هەروەها تەماح لەژنە جوانەکەی مالك بن نويرة دەکات، مالك بن نويرة سەرئەپڕێ ،بە بیانوی نەدانی زەکات سەرەکەشی لەگەڵ سەری دوانزە دیلی تردا دەکوڵێنێ لە مەنجەڵێکدا سەری مالک زۆر قژو ڕیشی پڕبوە بوە درەنگ کوڵاوە دوایی خالید بۆ چاو ترساندنی چواردەورەکەی لە ئاووگۆشتی سەرە کوڵاوەکە دەخوات.هەر دوای سەر پرینەکە لەگەڵ ژنەکەیداکە ناوی لەیلای کچی سینان بوو،کە یەکێک بووە لە هەرەکچە جوانەکانی عەرەب بە زۆردەی باتە جێگەوە.مالکی کوری نویرە یەکێک بووە لە سەرکردە دیارو متمانە پێکراوەکانی خێڵی یەربوع لە هۆزی تەمیم، خۆی و براکەی ئەسپ سوارێکی ئازاو شاعیرێکی ناوداری هۆزەکەی خۆیان بوون، بە هۆی موسڵمان بوونی ئەم پیاوەوە هەموو کەسوکارو هۆزەکەی بوونەتە موسوڵمان، یەکێک بووە لە صەحابەکانی موحەممەدو لە دەستپاکی و متمانەییدا موحەممەد کردبوی بە سەرپەرشتی ئەو پارەوپولەی کە لە ڕێی زەکاتەوە کۆدەکرانەوە. ئەبو قیتادە بەم کۆمەڵکوژی و غەدرەی خالید پەست و نیگەران بووەو گەراوەتەوە بۆ مەدینەو چیرۆکەکەی بۆ ئەبوبەکری صدیق و عومەری کوری خەتاب گێراوەتەوە، سوێندیشی خواردووە کە چیتر نەچێتە هیچ شەڕێکەوە کە خالید سەرکردایەتی لەشکرەکە بکات. هەروەها عومەری کوری خەتابیش بە خالیدی وتووە:
يَا عَدُوَّ اللَّهِ قَتَلْتَ امْرَأً مُسْلِمًا ثُمَّ نَزَوْتَ عَلَى امْرَأَتِهِ ، لَأَرْجُمُنَّكَ.
ئەی دوژمنی خودا، کەسێکی موسڵمانت کوشت و ژنەکەیت لاقەت کرد، ئەبێ ڕەجمت بکەم.
بەڵام ئەبوبەکری صديق نەی هێشتووەو بە عومەری وتووە:
تَأَوَّلَ فَأَخْطَأَ.لێی مەگرە وای زانیوە کارێکی باشی کردووە بەڵام بە هەڵەدا چووە. ئەبو بەکر هەمان قسەی محمد دەکاتەوە بە عمر دەڵێت وازی لێ بێنە پێویستم بە خالیدە بۆشەڕی کافرەکان..خالید لە هەمووشەڕێک کەکردبێتی ئەسیرەکانی کوشتوە ووتویەتی حەز دەکەم لافاوی خوێن ببینم،لە شەڕی هەڵ گەراوەکاندا لە گەڵ موسەلەمە بە هەزارەها کەس دەکوژێت بە ئەسیرەکانەوە دەڵێن ١٢٠٠٠موسڵمانیش دەکوژێت هەر ئەو شەوە لەناو ئەو هەموو لاشەیەدا خالید ژن مارە دەکات و لە گەڵیا دەچێتە پەردەوە ئەبو بەکر پێی دەڵێت بتهێشتایە خوێنی هاوەڵەکانت وشک بوایەتەوە ئینجا ژنت بهێنایە. لە کوردستانیش دا گەورەترین پرۆسەی ئەنفال و ڕەشە کوژی دەکات ئەمە بەشێک کەم بو لە ژیانی دڕندەترین سەرلەشکری ئیسلام .لە دوایدا ئەبوبەکر دووری خستەوە لە خۆیان ڕەوانەی شەرەکانی رۆم و کوردو فارسی کردوە لە کۆتایی ژیانیدا لەسەرلەشکری لایان بردو بە تۆمەتی دزی کردن لەو پارانەی کە دەستی کەوتوە لە تالانی ووڵاتان ، ئێستا دەتوانم بڵێم خالید دەناسن . بەم ڕەوشتە جوانەی کوردی موسڵمان کردوە

تێبینی
)پەیامبەری ڕەحمەت و خۆشەویستی وئاشتی کە ٢٣ ساڵ پەیامبەبوو ٢٨شەڕی کرد لەگەڵ

خزم وناسیاو خێڵەکەیان و خێڵەکەی دراوسێیان کرد کە هاوزمان هاوکلتوری بوون قورئانەکەشی هەرەبەزمانی عەرەبی بوو بۆئەوەی ڕ‌پرواى پێ بێنن لەسەر ئەوەشە ڕوایان پێ نەهێنا ئەم هەمووشەڕەی لەگەل کردن، لەدوای مردنی محمد کۆمەڵێکی زۆریان هەل گەڕانەوە دەست بەرداری ئەو دینە بون کە بەزۆر سەپێنرابو بەسریاندا .ئەمانەش ناوی شەرەکانە بێجگەلە شەڕی تاڵانی و ڕوت کردنەوەی کاروانەکان. حرب الفجار ،غزوة الأبواء (ودان) ،غزوة بواط ،غزوة العشيرة ،غزوة بدر الأولى،غزوة بدر الكبرى، غزوة بني سليم ،غزوة بني قينقاع ،غزوة السويق ،غزوة ذي أمر، غزوة بحران ،غزوة أحد ،غزوة حمراء الأسد ،غزوة بني النضير،غزوة ذات الرقاع ،غزوة بدر الآخرة ،غزوة دومة الجندل ،غزوة بني المصطلق ،غزوة ال،خندق ،غزوة بني قريظة،غزوة بني لحيان ،غزوة ذي قرد،غزوة الحديبية صلح الحديبية،غزوة خيبر،غزوة عمرة القضاء ،فتح مكة ،غزوة حنين،غزوة الطائف ،غزوة تبوك (.

سەرچاوەکان: سير أعلام النبلاء، سيرة الخلفاء الراشدين، سيرة أبي بكر الصديق رضي الّه عنه، مقتل مالك بن نويرة التميمي الحنظلي. عز الدين أبو الحسن علي المعروف بابن الأثير، الكامل في التاريخ، دار الكتاب العربي، سنة النشر: ١٤١٧هـ/١٩٩٧ صحيح المسلم، كتاب الإيمان، باب الأمر بقتال الناس حتى يقولوا لا إله إلا الّه محمد رسول الّه. الامام السيد عبدالحسين شرالدين: النص والاجتهاد، ص٩٣ ابن اثير: اسد الغابة في معرفة الصحابة، بەشی پیتی(خ) خالد بن الوليد، بەشی پیتی(م) حياة الصحابة، ڵکاندهلوی: قصة خالد بن الوليد ومالك بن نويرة. البداية والنهاية، ابن كثير. ج١ فصل في خبر مالك بن نويرة اليربوعي التميمي. ابن الحجر، العسقلاني: الإصابة في تمييز الصحابة.ج٣ص٣٣٧. العقاد فی عبقرية الصديق، الصديق ابوبكر،، الجزء الثاني، ذكر أحداث سنة إحدى عشرة » ذكر مالك بن نويرة.محمد حسين هيكل.ص ١٤٣

چاوەڕێی بەشی سێیەم بکەن...

وێنەکان
خالید کوری وەلید
لەیلا ژنی مالك بن نويرة لەگەڵ خالیدا
گۆرە وێران کراوەکەی خالید کوری وەلید.

تێبینی: هەموو ڕۆژێک سەعات ٥ی ئێوارە بەکاتی کوردستان- هەولێر بەشی تازە بڵاوئەکەینەوە.

## ئەنفالی کوردان لەژێر سێبەری شمشێردا.

بەشی سێیەم

ڕۆژی دووشەمەبوو لە شکرەکەی خالیدی کوری وەلید گەشتە سنوری شاری هەولێر خێوەتەکانیان هەڵدا کەژمارەیان ٤٠٠٠٠هەزارسەربازبوو، (ئای لەورۆژە ڕەشە ی کە بەرێوەیە بۆکورد ئەوگەلەی کە بیری چاک و ووتەی چاک و کرداری چاک کلتوریان بوو خاوەنی ئاینی مەزدا بون زەردەشت پەیامبەریان بو ئاشتی ئاوەدان کردنەوە تاکە ئامانجی دینەکەیان بووشەڕوخوێن ڕشتن حەرام بو نەمام ڕواندن جۆگە هەڵکەندن عیبادەت بو خۆشەویستی خوابوو، بەڵام ئەمرۆ اڵلە عەرەبەکە کۆمەڵی خوێنرێژ یاوەتە پێش خۆی وبە سورەتی ئەنفالەوە بەئایەتی بکوژە ببرە حەڵاڵی خۆتە بەتەماحی تاڵانی سەروماڵەوە هاتوون و لەدەرگای ووڵاتەکەت دەدەن.(

پاشای هەولێر ناوی چاتلیس بوو لەسەر ئایینی مەسیح بوو ئەم میرە زۆر سوار چاک بو دەڵێن زۆرباش شارەزای هونەرەکانی جەنگ بوە ئەم میرە خاوەنی١٤٠٠٠هەزار سوارەو پیادەی بوو زۆرجار یارمەتی کسرای دەدا لە دژی هەرقلی ڕۆم.
کاتێ چاتلیس بینی سوپای عەرەب لە نزیک قەڵای هەولێر هەڵیان داوە. میر فەرمانی کرد بەسوپاکەی دەرگای قەڵای کردەوە هێرشی کردە سەریان شەڕ دەستی پێکرد،خالیدی کوری وەلید کە ئەمە بینی ووتی ئەمە یەکەم شەڕە ئێمە لەگەڵ میری هەولێردەیکەین پێشتر شەڕو ڕووبە ڕووبونەوەم هەبوە لەگەڵ کورد لە تکریت و موسڵ شارەزای شێوازی شەڕی ئەوانم.
خالید هاواری کرد دەستیان لێ نە پارێزن بە هەموو هێزێکی خۆتان لێیان بدەن بیان کوژن ماڵیان بۆ ئێمەیە وغەنیمەی شەڕە ڕۆحی پیسیان بۆ جەهەنەمەکەی اللە دەنێرین.
ئەگەرئێمەش کوژراین ئەوا جێگەمان بەهەشتەو دەبین بە میوانی اللە بەردەوام بوو لەقسەکردن و ووتی محمد دەڵێ(الجنە تحت ظلال السیوف) ئێمە چەند ساڵێکە لەشەڕداین تەواو شارەزای شەڕین سوپای کورد زۆر دەمێکە شەڕیان نەکردوە هەروەها سوپای کورد لە سوپای کیسراو سوپای ڕۆم زیاتر نیە، شەرێکی یەجگار گەورە دەست پێ کرد تەپو تۆزی سمی ئەسپەکان بەری خۆری گرتبو بەهەزارەها مرۆڤ کوژران چەندەها دەست و قاچ پڕان چاوەکان کوێر کران خوێن و خۆڵ تێکەل بو ئەم شەڕە چەند ڕۆژێکی خایاند هەولێریەکان زۆر نەبەردانە بەرگریان دەکرد ئەوەی لە توانایان دابوو کردیان تا دوا سەرباز جەنگان ،میر چاتلیس بە دەستی ضرارکوری الأزور کوژرا .
)ضرار بن الأزور کێیە لە دوای فەتحی مە کە بە ناچاری موسڵمان بوو شاعربوو یەکێ بوو لەپیاوکوژەکان زۆر حەزی لە شەڕکردن بوە دەڵێن زۆر بێ بەزەیی بوە هە رنەیارێکی خۆی بەر دەست کەوتبێت بێ دوودڵی سەری پریوە خۆشەویستی محمد بوە. محمد وتوویەتی ضرار جێگەی لەدڵی من دایە .دەڵێن ناوهێنانی بەس بوە بۆئەوەی ترس بچێتە دڵی دوژمنەکانی.
زراری کوری ئەزووروەک سەرکردەیەک بە فەرمانی ئەبوبەکری سدیق بەشداری شەڕەکانی هەڵگەڕاوەکانی کردوە بە فەرمانی خالید سەری مالك بن نویرة پری . زراریش وەک خالیدی کوری وەلید هیچ شارەزایەکی ئەوتۆی نە بووله بارە قورئانەوە بە تەنها چەند ئایەتێکی شەڕو تاڵانیان پێ لەبەر کردبوون ناردویانن بۆ داگیر کردن و موسڵمان کردنی وولاتان لە کاتێکدا خۆیان بە نا چاری موسڵمان بوون،هەر گیز کاتیشان نە بوە بۆ فێر بوون هەمیشە لە شەڕدابون هەروەها ئەوکاتەی کە دەست کرا بە داگیر کاری وولاتان قورئان هێشتا کۆنە کرابۆوە چەنکەسێک کە بە پەنجەی دەست دەژمێردران ئایەتەکانیان لە بەر بوو.زرار خاوەنی پارەو ماڵێکی زۆربوە.(.
شەو بو شەڕەکەی هەولێر کۆتای پێ هات شیوەن و گریان ترس و لەرز کەوتە ناو دانیشتوانی قەڵاوە کە نەیان دەزانی چی چاوەڕوانیان دەکات. ١٠٠٠ هەزار سەربازی کوردی هەولێری بە دیل گیرابون بۆڕۆژی دوای هێنایانە بەردەم خالید کوری وەلید پێی ووتن ئیسلام بن ئەوانیش ڕازی نەبوون ,ووتیان ناتوانین واز لە ئایینی باو باپیرانمان بێنین، بۆیەخالید فەرمانی کرد هەموویان سەربرن. دوایی چاڵێکی گەورەیان بە کەسوکاری کوژراوەکان هەڵ کەندو هەموو کوژراوە کوردەکانیان تێ کردو ناویان نا گۆری کافرەکان، بەرد باران کران. کوژراوە عەرەبە موسڵمانەکان دەکرانە گۆری جیاجیاوە هەر بە جلەکانی خۆیانەوە دەنێژران لە بەر ئەوەی پێیان وا بوو ئەمانە شەهیدن . دوایی سەرکەوتنە سەرەوە بۆ قەڵای هەولێر کەوتنە تڵان کردنی سەرو ماڵیان هەرچی کچی جوان و کوری منداڵە وەک دەست کەوتی شەڕدەستیان بەسەردا گرتن دەکران بە کۆیلە کەنیزە .بەشێکیان بۆ خۆیان گلدایەوە بەشەکەی تریان دەنارد بۆ مەدینە بۆعمری کوری خەتاب لەوێ دەکرایە بەیت المالەوە ئەویش زۆر عادیلانە  دوای دابەشی دەکرد بەسەر موسڵماناندا هەروەها هەرچی ژن و کچ و مێردمناڵەکانە وەک کەنیزە غولام دەفرۆشران و دەکڕدران لە بازاڕەکانی مەکەو مەدینەدا.
خالید دوای خۆی ڕووی کردە قەڵای هەولێرڕۆشتە ناو خەڵکەکەوە پێی ووتن ئەگەر موسڵمان

نه بن دەبێت جزیە بدەن یان هەمووتان دەکوژم ئیتر خەڵکەکە ڕازی بوون بە جزیە ( خالید زۆر دڵخۆش بوە بە موسڵمان نە بونیان ڕازی بونیان بە جزیە لەبەر ئەوەی جزیە وەک سەرمایەیەک هەمیشەی وابوە بۆیان خەرجی شەرەکانیان پێ دابین کردوە.لە دوای داگیر کردن وتاڵانکردن وسوتاندنی هەولێر پاشان خالید بە عبداڵلەی جندلی دەڵێت سوپایەک بەرە و پرۆ ڕووبکەرە ئەرمۆتە بۆداگیر کردنی.
تێبینی
ئیسلام بە هیچ جۆرێک کۆیلەو کەنیزەی حەرام نەکردوە بگرە برەویشی پێداوە بەلایەنی کەمەوە لە ٢٩ ئایەتدا اڵلە عەرەبەکە کلتوری خێڵەکی عەرەبی بەسەریدا زاڵ دەبێت و ڕێی دەدات کە موسڵمانان لە شەڕەکانیاندا لە گەڵ کافرو بێباوەڕەکاندا دەست بگرن بە سەر ژن و کچ و کورە ماڵیاندا لە بازاڕەکان مامەڵەیان پێوە بکەن واتە کڕین و فرۆشتنیان پێوە بکەن ، یان بەئارەزوی خۆیان لەگەڵیاندا ڕابوێرن بەکچ وژن دەوترا کەنیزە ،ئەمانە بۆیان نەبوو وەک ئافرەتی موسڵمان خۆیان داپۆشن ئەم کەنیزانە تەنیابۆیان هەبوە لە ئەژنۆکانیانەوە تا سەر ناوکیان داپۆشن . محمد وو هەموو سەحابەو خەلیفەکان کۆیلەو کەنیزەیان هەبووە .ئەم دیاردەیە هەتا ساڵی ١٩٦٣لە ناو عەرەبدا باوی بوە کار بەو ئایەتانە کراوە هەتا دوایی بەیاسای نیودەوڵەتی قەدەغە کرا هەرچەندە تائێستا لە هەندێک وولاتی موسڵماندا بەدزیەوە هەر کار بەو ئایەتانەی قورئان دەکرێت. ئاخرجاریش داعشەکان ئەم فەرمانەی اڵلە عەرەبەکەیان جێبەجێ کرد بەسەر کوردانی ئێزدی مەسیحیەکاندا ئەمەش ژمارەو ناوی هەندێک ئایەت کە باس لە حەڵاڵ کردنی کۆیلەو کەنیزە دەکات ئەمە ووشەکەیە" مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ - مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُمْ - مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُنَّ " لەم ئایەتانەدا: سورة النساء ٣ – سورة النساء ٢٤- سورة النساء ٢٥- سورة النساء ٣٦- سورة النحل ٧١- سورة المؤمنون ٦ – سورة النور ٣١- سورة النور ٣٣ – سورة النور ٥٨ – سورة الروم ٢٨- سورة الأحزاب ٥٠ – سورة الأحزاب ٥٢- الأحزاب ٥٥
کەواتە ئەو کوڕو ژن وکچانەی کە لە کوردستان لەشەڕەکاندا دەست بەسەر کراون بوون بە دەست کەوتی شەڕوو وەک کۆیلەو کەنیزە هەڵسوکەوتیان لەگەڵدا کراوە
ئەم فلمەش لە ساڵی ١٩٦٤ لە سعودیە گیراوە وەک بەڵگە لەسەر ڕاستی قسەکانم بۆتان دادەنێم تا بە چاوی خۆتان ببینن تا هیچ گومانێک لە لاتان نەمێنیت
بازاڕی کۆیلەو کەنیزە لە سعودیەی عەرەبی ئەم فلیمە بەڵگەییە لەساڵی ١٩٦٤ گیراوە کە بە چاوی خۆمان دەبینین کە عەرەب فەرمانەکانی اڵلە یان جێبەجی دەکەن و لە
بازاڕەکانیان کرین و فرۆشتن بە مرۆڤەوە دەکەن لەژێر رۆشنایی ئایەتەکانی قورئان هەروەها دەبینین پارێزەرانی ماڵی اڵلە عەرەبەکە بە پارەی حاجیەکان دەڕۆن بۆ سەیرکردنی ئافرەتی سۆزانی لە ئەوروپا.
https://www.facebook.com/video.php?v=933830696632443
سەرچاوە
)فتوح سواد العراق) واقیدی
١ - الاستیعاب [ج١ ٢ص ٢٤[
٢ - الإصابة [ ج٣ ص ٤٨٢[
٣ - أسد الغابة [ج١ ص٥٣١[
٤ - أسد الغابة [ج١ ص٧٨٢[
٥ - الإصابة [ج٣ ص٤٨٢[
٦ - الاستیعاب [ج١ ص ٢٢٥
امام واقدی بەیەکەم مێژوونوسی موسڵمان ناسراوە

چاوەڕوانی بەشی چوارەم بکەن
وێنەکان
هەولێر

لەشکری عەرەب
وێنەیەی بەڵگەیی کەنیزە
بەڵگەنامەی کڕین و فرۆشتنی کەنیزە لە وولاتی موسڵمانان

تێبینی: هەموو ڕۆژێک سەعات ٥ی ئێوارە بەکاتی کوردستان- هەولێر بەشی تازە بڵاوئەکەینەوە.

ئەنفالی کوردان لەژێر سێبەری شمشێردا.

بەشی چوارەم

لەپاش ئەوەی لە شەڕی نابەرابەرەی هەولێردا بەهەزارەها لاوی کورد خەڵتانی خوێن کران پاشا چاتلیس بەدەستی زراری بن ئەزور بەنێزەکێکی ژەهراوی سنگی لەت کرا کوژرا بەڵام لە سوپای عەرەبی موسڵمان تەنها ٩٠٠سەرباز کوژرا!!کوژاوەکانیان هەرلەجێگەی خۆیاندا ناشت دوا بەدوای ئەم شەرە خالید کوری وەلید ڕووی کردە عبدڵلە جندلی پێی ووت سوپایەک بەرە پرۆ بۆ( ئەرموتە) ئەرمۆتە دێیەکە لە نزیک شاری کۆیە کاتێ عبدڵلە جندلی بەڕێکەوت بەخۆی سوپاکەیەوە دەگەشتنە هەر ئاواییەک تاڵانیان دەکرد سوپای ئیسلام زۆر دڵخۆش بوون بەکۆکردنەوەی ئەو هەموو مەڕومالاتە بەلام پیاوانی ئاوایەکان بە نهێنی دێکانی خۆیان بە جێ هێشتبوو چوو بوونە بۆسەوە بۆسوپای ئیسلام توانیان هێزێکی باش دروست بکەن گەمارۆی سوپاکەی عبدڵلە جندلی بدەن پاش شەڕێکی گەورە ی دەستەو یەخە کوردەکان توانیان عبدڵلە جندلی بکوژن سوپاکەشی تەفروتونا بکەن تالانیەکانیشیان لێ بسێنەوە.هەواڵی کوشتنی عبدڵلە جندلی لە ناوچونی سوپاکەی گەشتە خالید کوری وەلید ئەویش بەشێک لە سوپای کەی کۆکردەوە لە هەولێر ڕووی کردە ئەرمۆتە لەپاش ڕۆژو نیوێک گەشتنە ئەرمۆتە ،خالید کەوتە تۆڵە سەندنەوە لەو ئاوایانەی کە عبدڵلە جندلی سوپاکەیان لەناوبردبوو خالید سوێنی خوارد ووتی دەبێ هەموویان بکوژرێن تا ببن بە پەند بۆئەوانەی دێنە سەر ڕێگای سەربازەکانمان ئەوە بو هەموو ئاوایانەیان تالان کرد هەمووپیاوەکانیشیان سەربڕی.پاشان لە نزیک گوندی ئەرمۆتە سوپاکەی خالید خێوەتی هەڵدا ،بەچواردەوری ئەرمۆتەدا دیواری بەردی بە هێز هەبوو ژمارەیەکی زۆرلە گاوران و پاڵەوانانی کوردی زەردەشتی کە گوێیان لە دەنگی سەربازە کانی ئیسلام بوو کەوتنە جنێودان پێیان ئەوانیش بەهەمان شێوە عبدالرحمانی کوری ئەبوبکری سدیق دەڵێت لەم شەڕە جنێوە دابوین خۆمان ئامادەکرد بۆ شەڕێکی گەورەکە ئێمەش هەر بۆ ئەوە هاتبوین عبدالرحمان کێیە(کوری ئەبوبکری سدیق یەکەم خەلیفەی موسڵمانان برای عائیشەی ژنی محمد لە جاهلیدا ناوی عبد الکعبة بوو محمەد ناوی گۆری بۆ عبدالرحمان ،عبدالرحمان سوارچاک بوو شەڕان گێزبوە لە مرۆڤ کوشتن دا لێزان بوشاعربو دوژمنی سەر سەختی محمد بو لە هەموو شەڕەکاندا دژی موسڵمانان دەوەستایەوە لە شەڕی بەدردا سنگی دایە پێش هاواری کرد موسڵمانان ئەگەرپیاوتان تیادا بێتەدەرەوە ڕووبەڕووم بێتەوە ئەوە بو ئەبو بەکری باوکی ڕقی هەستاو ووتی من دەڕۆم دەی کوژم محمد دەستی گرت نەی هێشت عبد ڕەحمان بە کافری مایەوە هەتا سوڵحی حدیبیە دوای کە کەس نەما ئەمیش بە ناچاری موسڵمان بو ئێستا هاتوە خوا بە کوردی زەردەشتی بناسێنێت(!
لە خۆ ئامادەکردندا بون بۆشەڕ عبد ڕەحمان دەڵێت لە ناکاو بینیمان قەشەیەک لەلایەن کافرەکانەوە هات کڵاوێکی سوری لەسەردا بوو بە سواری هێسترێکەوە بوو لە دورەوە هاواری

کرد بە زمانێکی عەرەبی زۆر باش زۆرمان بەلاوەسەیر بو کوردێک ئەتوانێت بە عەرەبی قسە بکات هاواری کرد قەومی عەرەب کێ سەرکردەتانە سوپا سالارتانە با بێتە پێشەوە قسەی لەگەڵ دەکەم دەست بەجێ خالید، چووە پێشەوە و وتی من سەرکردەیانم قەشە پێی ووت هەتا ئێستا هیچ پاشایەک نەی وێراوە بێتە وولاتی ئێمەو شەڕمان لەگەڵدا بکات بەڵام لەبەر ئەوەی لە جێیەکی دورەوە هاتون لەبەر خاتری خودا شتێکتان دەدەینێ کە بیخۆن بڕۆن ئە گەر نا ئەوە توشی شەڕێکی سەخت دەبن لەگەڵ ماندا خالید لە وەڵاما ووتی وولاتی کورد لە وولاتی فارس و رۆم زیاترنیە کۆتایی بە قسەکانیان هات قەشە گەڕایەوە بۆلای پاشاکەی کە ناوی پتروسی کوری کرباش بوو، قەشە قسەکانی خالیدی گێرایەوە بۆ پاشاکەی ئەویش زۆر تووره بو یەکسەر سوپای ئامادەکرد بەرەورووی موسڵمانان هێرشی برد خالید هاواری کرد ئەی موسڵمانینە ئێمە ئە گەر بکوژرێین باخ و باخاتی بەهەشت و حۆریەکانی چاوەروانمانن (ئەوانیش دەتۆپن دەچنە جەهەنەم ؟)دوا بە دوای ئەم قسانە هەردوو سوپاکە تێک ڕژان شەڕێکی گەورە قەوما ڕۆژی حەشر هەستا ڕۆژی ڕوناک تاریک بوو لە تەپوتۆزی پێی ئەسپەکان هاوارهاواری دەستوقاچ براوەکان گوێی کەڕ دەکرد چەندەها ئەسپ بە بێ سوار لەوی دەسوڕانەوە ئەو ڕۆژە هەتا ئێوارە شەر بەردەوام بو خالید کوری وەلید توانی زەفەر بەرێت بە پاشا پترس لە دورەوە بە رمێک بیکوژێت بە مە ورەی سەربازەکان ڕوخا گەڕانەوە ناو قەڵاکە خۆیان ئامادەکردەوە بۆرۆژی دوایی براکەی پترس کەناوی برابری بو شەڕی دەست پێکردەوە شەربەردەوام بوو کۆمەڵێکی زۆر لە هەردو لا کوژرا دوایی زرارکوری ئەزور توانی برابرای بکوژێت سوپاکەیان هەڵهاتن چونەوە ناو قەڵای ئەرمۆتە بەڵام موسڵمانان نەیان توانی قەڵاکە بگرن دەڵێن لەو شەڕەدا ۷۰۰۰ کورد کوژرا بەڵام مێژوو نوسەکە باسی کوژراوە موسڵمانە عەرەبەکان ناکات. دوایی ۸۰۰ کەس بە ئەسیری دەبەنە بەردەم خالید ئەویش پێیان دەڵێ یان موسڵمان بن یان جزیە بدە ن (واتە سەرانە)ئەوانیش ڕازی نابن خالید دەڵێت لە سەریان بەن ئەوانیش هەمویان سەر دەبڕن دەیان کەنە گۆری بەکۆمەڵەوە

سەرچاوە

)فتوح سواد العراق) واقیدی

ء الطبقات الكبرى.

ء الإصابة في تمييز الصحابة.

ء فتح الباري في صحيح البخاري.

چاوەڕوانی بەشی پێنجەم بن

تێبینی: هەموو ڕۆژێک سەعات ٥ی ئێوارە بەکاتی کوردستان- هەولێر بەشی تازە بڵاوئەکەینەوە.

ئەنفالی کوردان لەژێر سێبەری شمشێردا.

بەشی پێنجەم

ئیمام واقدی ئاوا ئەم مێژووە دەگێرێتەوە" لە موسای کوری عەقبەوە، ووتی: پاش ئەوەی خالید کوری وەلید، هەموو دیلە کوردەکانی کوشت لە نزیک قەڵای ئەرمتۆتە، دوایی سوپا شکاوەکەی ئەرمۆتە هەڵهاتن، پەنایان بردەوە بەر قەڵاکەیان ئیتر سوپاکەی خالید نەیتوانی بچێتە ناو قەڵاکە و گەڕانەوە دواوە و چونەوە خێوەتەکانیان. بەیانی زوو سوپایەکی کوردی خەڵکی کۆجاڕ (کۆیە)، هێرشێکی گەورەیان کردە سەر لە شکرەکەی خالید کە لە کۆجاڕەوە هاتبوون واتە (کۆیە). کۆیە، ۳ کیلۆمەر لە هەرمۆتەوە دووره بۆیارمەتی قەڵای ئەرمۆتە زۆربەیان زرێ پۆشبون شمشێر بەدەست بون زۆریا لە موسڵمانان کوشت شەر بەردەوام بو هەتا ئێوارە سەربازەکوردەکانی کۆیە پاشەکشەیان کردچونە ناو قەڵاکە لەتوانای سوپاکەی کۆیەدا نەبوو

سوپا بێ شومارەکەی عەرەبی ئیسلام لەخاکی کوردستان دەربکەن(بەداخەوە سوپای کورد هێزێکی ناوچەیی بووە. واتە، هەرناوچەیەک وکۆمەڵێک سەربازیان هەبوە ئەم هێزانەش یەک گرتوو نەبون پارێزگاریان بەتەنها لە ناوچەکانی خۆیان کردوە). هە تا سێ ڕۆژ بەو جۆرە شەڕ بەردەوام بوو. سوپای عەرەب بە هەموو جۆرێک هەوڵیدا قەڵاکە بگرن. بەڵام، نەیانتوانی و سەربازێکی زۆریشیان لێ کوژرا. هەتا شەوێکیان کوردێک کە ناوی کۆلاوە کۆن بوو. لە قەڵاکە بەدزیەوە هاتە دەرەوە وەک خیانەت کارێک چوە لای خالید پێی ووت کارێکی زۆر زۆر ئاستەمە گرتنی ئەوقەڵایە لەبەر ئەوەی ئەوقەڵایە دیوارەکانی زۆر پتەوە ڕاستە ئێوە پاشا پوترس براکەیتان کوشتوە بەڵام ئێستا پاشایەکی زۆر بەهێزی کورد هاتۆتە قەڵاکە ناوی چاروسە زۆر جوامێرە پاڵەوانێکە لە وێنەی نیە. خالید، پێی ووت: تۆ دەتوانی چی بۆ من بکەیت؟
کۆلاوە کون، ووتی: من دەتوانم قەڵاکە بدەم بە دەستەوە. خالید، ووتی: چۆن ؟کۆلاکۆن ووتی: لە ژێر ئەو گردەدا کارێزیان لێداوە ئاوەکەی دەچێتە قەڵاکەوە. ئەگەر بێتو ئاوەکەیان لێ بگرن ئەوا لە بەر بێ ئاوی و توینێتی، خۆیان دەدەن بە دەستەوە.
خالیدو سەحابەکان زۆر دڵ خۆش بوون کەوتنە اللە اکبر. بە پەلە ١٠کەسی بە دزیەوە لەگەڵ کۆلاوە کون نارد بۆ ئەو گردەی کارێزەکانی تیادایە و توانیان ڕێڕەوی ئاوەکە بگۆرن و نەهێهڵن ئاوەکە بچێ بۆقەڵاکە. بەم جۆرە، ئاویان لەقەڵاکە بڕی و کوردەکانیش بۆ ماوەی سی( ٣) ڕۆژ توانیان خۆیان بگرن ئەویش بەهۆی ئەو خەوزە ئاوانەی لە ناوقەڵاکەدا بو ئەوانە ش ئاویان تیا نەما. ئیتر تینوێتی زۆری بۆهێنان و چەندەها ژن و منداڵ لەبەر بێ ئاوی ووشک هەڵ هاتبوون کە گریان و هاواریان ئاسمانی پرکردبوو. هیچ هیوایەکیان نەمابوو. ئەوە چارەنووسەو ئەوە ئەمری اللە، زۆرێک لەوان لەبەرتینوێتی لەهۆش خۆدەچوون و دەمردن. ئای چ کارەساتێ بوو! منداڵ لە بەردەم دایک و باوکیا ڕۆحی دەردەچوو. قومێک ئاونەبوو بیکەن بەدەمیەوە. پاش سی ڕۆژلە گەمارۆی قەڵاکە سەربازە کوردەکان تینوێتی زۆری بۆهێنان و ناچار هێرشیان کردە سەر سەربازە ئیسلامە عەرەبەکان. شەڕێکی قورس بەرپابوو. کوردەکان شەری مان و نەمانیان دەکرد. دەبوایە ئەوندە بەرگری بکەن هەتا ژن و منداڵەکانیان ڕزگاربکەن لە چنگی عەرەب.
بەڵام، سەرکەوتوو نەبوون. هەڵ هاتن ڕوەو کۆیە. سوپای عەرەب، دوایان کەوتن تا بەربەیان لە نزیک کۆیە دوبارە شەڕ دەستی پێکردەوە. لەو شەڕەدا ١٢٠کورد کوژان.کوردەکانی کۆیە لەوشەڕەدا توانیان سوپای عەرەبی موسڵمان ڕاو بنێت
، لەئەرمۆتەش دەست گیرا بەسەرقەڵاکەدا و هەرکەسێک لەقەڵاکەدا بوو، خالید، لە تۆڵەی کوژاوە کانیان هە موویانیان کوشت و پاشان، دەستیان کرد بەتاڵانی.
ئیمام واقدی، دەنوسێت: خالیدی کوری وەلید، بە شکست و لەدەستدانی زۆرێك لەسەربازەکانی لە کۆیە، زۆر تورەبوو ووتی، دەبێت ڕۆژی ڕووناکیان لێبکەم بە شەوی تاریک. سوپاکەی کۆکردەوەو پێی ووتن، ئەمرۆ دەبێت تۆڵەی هاوەڵەکانتان لە خەڵکی کۆیە بکەنەوە. سەریان بۆ من و ماڵ و ئافرەتەکانیان غەنیمەن بۆ ئێوە. پاشان، سوپایەکی گەورەی ئامادەکرد، ڕووی کردە کۆیە بۆ شەڕ بەرامبەر بەهێزێکی کەمی ماندووی شپرز،ە کە دەبوایە شەڕیا ن لە پێناوی سەروماڵیاندابکردایە. شەڕ دەستی پێکرد. ئەو ڕۆژە کۆییەکان، هەرچی لە توانایان دابوو کردیان. شەڕبەردەوام بووهەتا تاریکی کرد. ئەو ڕۆژە سوپای عەرەبی موسڵمان بە دەم اللەو اکبرەوە هەرچی خوا پێی ناخۆش بوو کردیان. دەستیان لە ژن و منداڵیش نەدەپاراست. لە کۆتایی ڕۆژدا کۆتاییش بە بەرگری کردنی کۆییەکان هات. خەڵکێکی زۆر کوژرا و سەربازەکانی ئیسلام کەوتنە تاڵان کردنی شار و بەشێکیان بۆخۆیان هەڵ گرت و ئەوەی مابوەوە ناردیان بۆلای خەلیفە عومەری عادلی لەخوا ترس. کەبەهیچ جۆرێ لەسەرچاوەی دەسکەوتەکانی نەدەکۆڵیەوە ئەویش کردیە بەیتول مالەوە عومەر، زۆر دڵخۆش بوو بەم سەرکەوتنە و دەستکەوتەکانیان. بەپەلە نامەیەکی بۆناردەوە کەتیا نووسیبووی بەردەوام بن لە داگیرکاریەکانتان و ڕوبکەنە ڕۆژ هەڵات. اللە لەپشتانە. ئەوانەی مابونەوەلە کۆییەکان ئاوایەکانی دەوروبەری بوون و رازی بوون بە جزیەدان( سەرانە) و وازیان لێهێنان.

تێبینی: ئەوەی جێگەی سەرنجە لە کۆیە دا تا ئێستاش بە کەسانێت ئەڵێن جاڕس کە لاسار و ئینکار بێت و من وا ئەزانم ئەم ناوە لە لایەن کوردەوە بەکار هاتووە هەر ئەم جاروسە بێت کە ئاوا ئیسلامی ئیزعاج کردووە و ئەوەی جێگەی سەرنجیشە ئەم کارێزە لە تۆپ زاوایە کە شوێنی بازگەی ئێستای کۆیەیە و کڵێسایەکی لێیە ناوی مەڕبێنە قەدیشایە و ئاوی ئەم ئەرمۆتەیە لەوێوە چووە.
٢لەگێرانەوەکەی ئیمام واقدیدا، بەڵام باسی سەربازە عەرەبە موسڵمانە کوژراوەکان نەکراوە ژمارەیان چەند بووە. بەڵام، ئەوەندە نەبێت نوسراوە، کوردەکانی کۆیە تونیان ١١ سەحابە بکوژن. بە داخەوە، ناوەکانیان نە نوسراوە. بەڵام ئێستا ئەگەر بچیتە کۆیە بە دڵنیاییەوە خەڵکی ئەوێ ناوەکانیان دەزانن. چونکە کڵکۆکانیان لەوێ بەناوی خۆیانەوە ماوە.
واقیدی کێیە
واقیدی ناوی موحەمەد کوری عومەری واقیدی یە لە ساڵی ١٣٠ کۆچی دا لە شاری مەککە لەدایک بوە لە بەغداد کۆچی دوایی کردوە زۆر کتێبی نوسیوە لە سەر داگیرکاریەکانی ئیسلام لە ئەسکندریە ئەرمەنستان و وولاتی بەینی ڕووبارو.وولاتی عەجەم وخۆراسان ووداگیر کردنی ئەفەریقا و داگیر کردنی زەویە بە پیتەکانی عێراق و شام. وجزیرە .داگیر کردنی کوردستان دەست نوسێکی واقیدی بوە بەناوی (فتوح سواد العراق) لەماڵی مەلا عەبدول سەمەد لە مەرگە تاکە نوسخەیە ،ئەو نوسخەیە یەک بەرگی لە سەر ئاگاداری شێخ ئەمین بێژەی لە بەری گیراوەتەوە دوای چەند نوسخەیەکی تریشی لەبەر گیراوەتەوە .دوایی محمد تەوەکولی داوا لە مەلا عەبدولعەزیزواعیزی سەردەشتی دەکات کە هەمووی لە عەرەبیەوە وەگێرێتە سەر فارسی ئێستا نوسخە ئەسلیەکەی لای نەوەی شێخ محمد ئەمینە .عەبدولعەزیز واعیزی سەردەشتی (لە ساڵی١٨٩٥ لەکۆیە لەدایک بوە دوایی بۆ مەلایەتی چوە بۆ سەردەشت٦٧ بڵاوکراوەی تری هەیە . (
هەروەها مەلا ڕەووف سەلیم حوێزی هەمان دەست نووس ساڵی١٩٧٠ بە ناوی کوردستان وئاینی ئیسلام ی بڵاو کردەوە بە دوو بەش لەیەک کتێب دا بەشێکیان بە هۆنراوە بەشی دووەم گێرانەوەی ئەو مێژووە بە نوسین (کوردیەکی کۆن زمانی مەلا) بەڵام ئێستا نە لە کتێبخانەکان و نە لە بازاڕەکاندا دەست دەکەوێت لەوە دەچێت قەدەغە کرابێت
مەلا ڕەووف سەلیم حوێزی ١٩٠٨ لە کۆیە لەدایک بوە چەند بەرهەمێکی تری هەیە.

تێبینی: هەموو ڕۆژێک سەعات ٥ی ئێوارە بەکاتی کوردستان- هەولێر بەشی تازە بڵاوئەکەینەوە.

ئەنفالی کوردان لەژێر سێبەری شمشێردا.

بەشی شەشەم

ئیمام واقدی، بەیەکەم مێژوونوسی موسڵمان ناسراوە ئەم مێژووە ئاوا دەگێڕێتەوە: " پاش تەمبێکردنی خەڵکی کۆیە، لەلایەن خالیدی کوری وەلیدەوە، کارێکیان پێکرا لە ناوچەکەدا دەنگی دایەوە. مەبەستەکەش هەر ئەوەبو ترس دروست بکات لە دڵی خەڵکی ناوچەکەدا بۆئەوەی کەس نەوێرێت بەرگری بکات. هەرچی بەرگری بکات، بەدەردی ئەرمۆتە و کۆیەکانی بەرێت.
ئیمام واقدی، دەنوسێت" وەرزی سەرما بوو، پاش نیوەڕۆ، نامەبەرێک هات. نامەیەکی عومەری کوری خەتابی دایە دەست خالید، کە تێیدا نوسرابوو: دەست خۆشی سەرکەوتنەکانتان لێ دەکەم. سوپاکەتان ئامادە بکەن بۆ جەنگ لەگەڵ کافران. هەرکەس ئاشتی دەکات، ئاشتیی لەگەڵ بکەن و جزیەیان لێ وەرگرن (سەرانە). هەرکەس ڕازی نابێت بەسەرانە، شەڕی لەگەڵ

بکەن. ئەوەی موسڵمانیش بوو، وازی لێ بێنن. ئێستا خۆتان ئامادە بکەن بەرەو ڕۆژ هەڵات.
خالید، کەماوەیەکی زۆر بوو لە کۆیە مابۆوە سوپاکەی کۆکردەوە و ناوەڕۆکی نامەکەی عومەری پێ ڕاگەیاندن. داوای لێکردن خۆیان بۆدەرچوون، ئامادە بکەن. سەیری کرد، بەدەم و چاوی سەربازەکانییەوە، ساردیەک دیاربوو.
خالید، زۆر بە تورەییەوە ووتی( ئێوە نازو نیعمەتی ئەم وڵاتەتان نەبینیوە. سوێند بەاڵله ئەگەر پابەندیش نەبوینایە بەجیهادوە تەنها لەبەر بژێوی ژیانیش بێت من ڕام وایە بەرەو قوڵایی ئەم وڵاتە بەڕێ بکەوین دەست بەرداری برسێتی و توێنیتی نەبوونی وڵاتی خۆمان بین. ئایا دەست بەرداری غەنیمەی شەڕ دەبن؟ ئیتر کە گوێیان لەمە بوو هەموو بەیەک دەنگ هاواریان کرد اڵله اکبر.

بابزانین ئەم سوپایەی لەگەڵ خالیدی کوری وەلیدا هاتوون کێن بۆچی هاتون؟ تۆبڵی ئەو سوپایە خۆیان موسڵمان بوبن تۆ بڵێی بێجگە لە ئایەتەکانی شەڕ وتاڵانی زیاتر گوێیان لەیەک ئایەتی تر بو بێت ؟

ئەم سوپایە، پێک هاتبوو لەو عەرەبانەی کە لەبیابانەکاندا دەژیان. پیان دەوترا ئەعراب. نەخوێندەواربوون و بەدواکەوتوترین خەڵکی ناوچەکە دەژمێردران. دەوار نشین بوون و خەریکی لەوەڕاندنی حوشتر و مەڕو بزن بوون. ژیانێکی کولەمەرگی دەژیان. نیمچە دورگەی عەرەب لەڕووی ئابورییەوە ناوچەیەکی هەژاربوو. ئەمەش بەهۆی کەش وهەوا بیابانیەکەی. هەرئەوەش خێڵە عەرەبەکانی ناچارکرد بۆململانێ ی خۆێناوی لەگەڵ یەکتردا. لە پێناو بەدەست هێنانی ئاو و لەوەڕگا بۆ بەخێوکردنی مەرومالاتەکانیان.لەوسەردەمەدا زۆربەی عەرەب نەیان زانیوە خۆشۆردن چیە هیوای تیابوە هەرگیز خۆی نەشۆردوە لە بەر کەمی ئاو دەڵێن کاتێ کاروانەکانیان بۆبازرگانی ڕۆشتوون بۆ شام هەر لەدوورەوە خەڵکی شام زانیویانە کە کاروانەکە عەرەبن و خەڵکی شارەکانی مەکەو مەدینەن لە بەر بۆگەنیان .خەڵکی جەزیرە زۆر زۆر هەژار بوون زۆربەیان خواردنی سەرەکی تەنها خورماو شیربوە. ئەم برسێتی و نەبوونی و یەکتر کوژییە وای لێکردن کە پەنابەرنە بەر سوپای ئیسلام و لە پێناوی غەنیمەدا (دەست کەوتی شەڕ) تاڕزگاریان بێ لە هەژاری.
بابزانین قورئان چۆن باسیان دەکات:
١ ) - ٩٧تەوبە) زۆربەی عەرەبە بیابان نشینەکان لە عەرەبە شار نشینەکان دڵ ڕەقترن لەبارەی کوفر و دوڕوییەوە، چونکە دوورن لەسەرچاوەکانی زانست و شارستانیەوە. ئەوان نەزانن بەوسنورانەی کە اڵله ناردوویەتی بۆ محمد دەربارەی حەڵاڵ و حەرام . واتە، تەواو نەزانن بە دینی ئیسلام.
٢) - فەتح١١)ئەوعەرەبە کۆچەریانە لە ڕێکەوتنامەی حودیبیە خۆیان شاردەوە بەشداریان نەکرد .کاتێک زانیان ئێوە بەرەو غەزای خیبەر دەڕۆن خێرا ئامادەیی خۆیان پیشان دا داوادەکەن لە محمد داوای لێ خۆشبوونیان بۆبکات لای اڵله.ئەوەی بە زمان دەیڵێن لەدڵیاندا نییە .ئەم ئایەتەش ئەوە دەردەخات ئەمانە شەڕیان بۆدەست کەوت کردوە نە بۆ اڵله دەتوانین بڵێن هەر بروایان پێی نەبوە.
٣) -١٤حجرات) بیابان نشینە عەرەبەکان ووتیان باوەڕمان هێناوە موسڵمان بوین پێیان بڵێ نەخێر باوەڕتان نەهێناوە بەڵام بڵێن بە ناچاری موسوڵمان بوین چونکە هێشتا باوەڕنەچۆتە ناو دڵەکانتانەوە تیایدا جێگیر نەبوە . ئەم ئایەتەش گەواهی بێباوەڕیان دەدات.
هەروەها واقدی، باسی ئەوە دەکات، ئەعرابەکان، هاتن بۆلای محمد و داوایان لێکرد بەشدارییان پێ بکات لە غەزای خەیبەرداو ووتیان لەو دەست کەوتە چەورە، بێ بەشمان مەکە. محمەدیش ڕازی نەبوو. لەبەرئەوەی دووڕوبوون و تەنها بۆ دەست کەوت هاتوون. محمد، دەی وویست دەست کەوتەکانی خەیبەر دەست هاوەڵەکانی خۆی بکەوێت.
ئەمانە هاتون بەو ئەقڵە شەڕەنگێزیەوە بەیاسای خێڵەکی کەدەڵێت هەمووشتێک لەناو بەرە لە

پێناوی مانەوەی خۆت . هەر ئەم ئەقڵەش بوو قورئانیشی داڕشت،لەگەڵ ئەو پاک و خاوێنیەی
کە لە بیاباندا هەیان بوە هاتوون کوردی زەردەشتی فێری مرۆڤ دۆستی و پاک و خاوێنی بکەن .
بەبیانوی هێنانی دینی تازە. وابزانم ئێستا سوپای ئیسلام دەناسن کێن و بۆچی هاتوون بۆ
کوردستان؟
تاریک و ڕوون بوو. سوپاکەی خالید، بەرەو ڕۆژهەڵات و بەرەو ناوچە شاخاوییەکان، کەوتنە ڕێ.
پاش ئەوەی خالیدی کوری وەلید هەڕەشەی لەکۆییەکان و ئاوایەکانی چواردەوری کرد، پێی
ووتن: ئەگەر هاتوو خیانەت بکەن لە سوپای ئیسلام ، ئەوا ڕەشەکوژتان دەکەم.

سەرچاوەکان
قورئان
حياة العرب في العصر الجاهلي
الواقدی:المغازی ج٢،ل٦٣٤
تەبەری لاپەڕە ٣٥٤
فتوح سواد العراق: واقیدی

چاوەڕوانی بەشی حەوتەم بن

ئەنفالی کوردان لەژێر سێبەری شمشێردا.

(بەشی حەوتەم)

امام واقدی ئەم مێژووە وا دەگێڕێتەوە

تاریک و ڕوون بوو سووپای عەرەبی موسڵمان بەڕێ کەوتن بەرەو قوڵایی کوردستان کە
ساڵانێک بوو خەڵکەکەی لە ئارامیدا دەژیان دەستی دوژمنیان لێوە دوور بوو. خالید فەرمانی کرد
بە چەند یەکەیەکی سەربازی کە پێش ڕەووی بکەن تا ئاسایشی ڕێگەکە دابین بکەن ئاگاداری
بکەنەوە لە هەموو هەڵسوکەوتێکی نەخوازراو. هەروەها چەند یەکەیەکی تری ناردە سەر
ئاوایەکانی ناوچەکە بۆ کۆکردنەوەی خواردن و ئالیک بۆخۆیان و ئەسپەکانیان.
ئەوڕۆژە، بەڕێوەبوون تا گەیشتنە نزیک ئاوایی رۆستەم، کە ئێستا ناسراوە بە ئاوایی میرزا
رۆستەم. خەڵکی ئەم دێیە بە حاڵی کۆیەکانیان زانی بوو. لەترسی سەرو ماڵیان کۆمەڵێک لە
ریش سپیی ئاوایی ڕۆستەم هاتن بەرەو پیری سوپاکەوە. پێیان ووتن، دواتان چیە تا پارێزراو بین
لە سایەتان؟
خالید، پێی ووتن: موسڵمان بن. ووتیان: ئێمە زەردەشتیین و باوەڕمان بە خوایە. ناتوانین واز
بێنن لەئاینی باوباپرانمان.خالید ووتی: کەواتە یان جزیە بدەن بەسەر شۆری یان مەرگ
چاوەڕوانتانە خەڵکەکە ڕازی بون بە جزیە. لەبەرئەوەی چارەیەکی تریان نەبوو. توانای بەرگری
کردنیشیان نەبوو.دواجار بە هەموو مەرجەکانیان ڕازی بوون و وەك کۆیلەش تەماشا دەکران. بۆ
نموونە، کوردێکی ئەو دێیە بۆی نەبووە بە سەرئەسپەوە بێت کاتێک عەرەبێک بەلایدا تێپەرێت
دەبوایە لە ئەسپەکە دابەزێت و عەرەبەکە سواری ئەسپەکە بێت.کوردەکەش بەپێ دوای
کەوێت تادەگاتە ئەوجێە بۆی دەچێت. هەروەک کۆیلەش بێگاریان پێ دەکردن.
مێژوو نووس دەڵێت: ئەوشەوە لە ئاوایی میرزا رۆستەم ماینەوە. بەیانی هەستاین. چی ببی
نین! بەفرێکی زۆر باری بوو و نەمان توانی لە ودێیە پڕۆین. ناچار، یەک مانگ و سێ ڕۆژ لەودێیە
ماینەوە. خەڵکی میرزا ڕۆستەم، هیچ خواردنێکیان نەمابوو و برسێتی زۆری بۆهێنان. داوایان
لێکردین دێکەیان جێی بێڵین.ئێمەش چاوەڕێمان تا بەفرەکە توایەوە دوایی خۆمان کۆکردەوە و لە
دێکە ڕۆشتین تا گە یشتینە سەر زێی بچوک کە کەوتبووە ڕۆژهەڵاتی ئاوایی میرزا ڕۆستەم.
خالید، سەیری کرد ئاوەکە زۆر هەڵساوە بواراداو ناتوانن بپەڕنەوە. ئیتر بەسەربازەکانی ووت
ئێوە بپەرنەوە منیش نزاتان بۆدەکەم. نزاکەی گرتی!. هەموویان بە سەلامەتی پەڕینەوە لەوبەر
بارگەیان خست

لەوێ، خالید ئەبو دجانەی بانگ کرد و پێی ووت: پڕۆ بۆلای پاشای مرجین(مەرگە) فروخ خان بانگی بکە بۆسەر ئاینی ئیسلام. ئەویش، سواری ئە سپێک بوو و ڕۆیشت. هێشتا لە چاوی هاوەڵەکانی وون نە ببو لە ئەسپەکە کەوتە خوارەوە. لەوکاتەدا زراری ئەزور چاوی لێ بوو چوو بۆلای خالید پێی ووت: چاوم لێ بوو ئەبو دجانە لە ئەسپەکەی کەوتە خوارەوە وابزانم نە خۆش بوو زۆر سەرمای بووە .
خالید، پێی ووت: ڕاکە پڕۆ بزانە چی ڕووی داوە.زرار، ڕۆشت سەیری کرد ئەبو دوجانە خوێنێکی زۆری لە بەر دەڕوات. پێی ووت ئەوە چیتە؟ ئەبو دوجانە، ووتی: ئاگام لەخۆم نەبوو. کوردێک، تیرێکی تێگرتم. لە قسە کردن نەبۆوە مرد.
لەوکاتەدا، زرار سەیر دوری کرد بینی بکوژەکە ئەبو دجانە ڕادەکات دوای کەوتن کوردەکە تیری گرتە ئەمانەش. بەڵام توانیان کەمەندی بۆ هەڵبدەن و دەستگیری بکەن. بەدوای ئەسپە کەی خۆیدا ڕایکێشا هەتا بەردەم خالید. قسەیان لەگەڵ کرد پیاوە کوردەکە تێنەدەگەیشت لێیان. ناچار، وەرگێڕێکیان بۆهێنا.
خالید، داوای لێکرد دانی پیا بنێت کێ ناردویەتی. ئەویش، نەیدەویست قسەبکات. خالید، کەوتە داخ کردنی هەتا هێنایە قسەکردن. دەرکەوت ئەمە پیاوی فروخ پاشایە و هاتوە بۆچاودێری هەلسوکەوتی سوپای ئیسلام. خالید، پرسیاری لێکرد دەربارەی لەشکرەکەی فروخ پاشا لەوەڵامدا ووتی: فروخ پاشا لەشکرێکی گەورەی هەیە کاغەزی نوسیوە بۆمامی کەناوی میر ئەژدەرە میری دووگۆمانە هەروەها نامەشی نوسیوە بۆمیری پشتدەر و میری منگران و زۆر میری تر کە بێن بۆ کۆمەکی. ئێستاش١٢٠٠٠ سەربازی ئامادەیە بۆشەڕکردن دژی ئێوە.خالید، داوای لێکرد ببێت بە موسڵمان و وەك جاسوس کاریان بۆ بکات. ئەویش ڕازی نەبوو ووتی: ناتوانم پشت لە ئاهورە مەزدا بکەم کەدینی باوباپیرمە. خیانەت لە فروخ پاشا ناکەم و تەنها ئەوگەورەی منە.
خالید، بە زراری ووت، ئەم کوردە، نێچیری خۆتە چۆن حەز دەکەی وا بیکوژە. ئەویش، بەزیندوێتی، کەوڵی کرد.ئەم جۆرە کوشتنەش زۆر بەئازارە هەتا گیانی دەر چوو هاواری دەکرد لەبەر ئەوەی لای قاچ و دەستی کون کردبوو بە قامیش فوی دەکردە کونەکانەوە هەتا ووردەوردە پێستەکە لە گۆشتەکەی دەبووەوە.بەڵێ، بەو جۆرە، لە تۆڵەی ئەبو دجانەدا کوشتی. لاشەکەی ئەبو دجانەیان هێنا کە هاوەڵی محمد بوو. بە جلەکانی خۆیەوە ناشتیان. تێر گریان و نوێژیان لەسەرکرد.
واقدی دەڵێت: لەوڕێگەیە دەست کەوتی باشمان هەبوو. غەنیمەی زۆرمان دەست کەوت. مەڕوومالات و ڕاخەر و گەنم و جۆ و ڕۆن. هەندێک لە ئاواییەکان ڕایان کردبوو. ئاوایەکانیان چۆڵ کردبوو و ڕوویان کردبووە شاخە بەرزەکان. مەڕوومالاتەکانیان بردبووە ئەوێ و لە ئەشکەوتەکاندا دەژیان. شەوانە، تروسکایی ئاگرەکانمان دەبینین. شوێنەکانیان زۆر سەخت بوو. نەمان دەتوانی شوێنیان بکەوین. بەردی گەورەیان تێدەگرتین. تیر بارانیان دەکردین. تیر هاوێژێکی بەتوانا بوون. تیرەکانیان لەداری چواله دروست کرابوو و جۆرێکی زۆر باش بوو هەندێکی تریان پەنایان بردووە بەر فروخ پاشا.
واقدی دەڵێت فروخ پاشا کاتێک زانی کە سوپای ئیسلام لە زێی بچوک پەریونەتەوە خۆی بۆجەنگ ئامادەکرد. ئەم فروخ پاشایە خوشکێکی هەیە ناوی (ئەزمری )یە زۆر زیرەک بوو لە بەرێوەبردنی کاروباری کشتوکاڵی و سەرپەرشتیی هەموو جوتیارەکانی دەکرد. کاروباری کشتوکاڵی ئەوناوچەیە هەمووی لەژێر دەستی ئەم دابوو. بەروبوومی ساڵانەی کۆدەکردەوە و دەینارد بۆ فروخ پاشا. ئەوناوچەیە تا ئێستاهەربەناوی ئەوەوەیە ناسراوە بە بنەی ئەزمری کەلە بەردەشانەوە هەتا بنگرد موقپسکە.
واقدی دەڵێت: هەندێک هەواڵی خورەوشتی فروخ پاشا گەشت بە خالید. ووتیان فروخ پیاوێکی زۆر بەسامە. ئازایە. هەرکاتێک توڕەبێت پاڵەوانەکانی دەوروبەری لەترساندا دەلەرزن. زۆربەی میرە کوردەکان لیی دەترسن. خوا پەرستە. ئاهورا مەزدا خوای ئەوە. ژنەکەی کچی پاشای قەڵاچوالانە.زۆر حەزی لە ڕاوە بەرازو ورچە. پاش ئاشنابوونی بەوردەکاری هێزو تواناکانی سوپاکەی فروخ پاشا، خالید، نامەیەکی هەڕەشە ئامێزی بۆ فروخ پاشا نوسی.
ئەمە دەقی نامەکەیە::
(قَاتِلُوا الَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِاللَّـهِ وَلَا بِالْيَوْمِ الْآخِرِ وَلَا يُحَرِّمُونَ مَا حَرَّمَ اللَّـهُ وَرَسُولُهُ وَلَا يَدِينُونَ دِينَ الْحَقِّ مِنَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ حَتَّىٰ يُعْطُوا الْجِزْيَةَ عَن يَدٍ وَهُمْ صَاغِرُونَ ﴿٢٩﴾) سورة

التوبة(بجەنگن لە گەڵ ئەوانەی کە پروایان بە اڵلە ورۆژی دوایی نیە،بە حەرامی نازانن ئەوەی وا اڵلە و پەیامبەرەکەی حەرامیان کردوە،وە خۆیان دین دار ناکەن بە دیینی هەق لەو کەسانەی کە کتێبیان پێدراوە تا بە دەستی خۆیان بەسەر شۆری سەرانە بدەن)
لە خالیدی کوری وەلیدەوە، سەرلەشکری سوپای عەرەبی ئیسلام، بۆ سوپا سالاری کوردان، فروخ پاشا. بە باشی دەزانم ئاگادارت بکەمەوە بە کوێستان و قەڵای پتەو و سوپاکەت لە خۆت بایی نەبی. لەشکرو سوپای تۆ لە لەشکرو سوپای هەرقلی ئمپراتۆری ڕۆم و سوپا زەبەلاحەکەی کیسرا زیاتر نیە. تۆدەزانی چیمان بە کوردەکانی دیاربەکرو موسل و هەولێر و کۆیەو تکریت کرد! ماڵ و منالیان بوون بەغەنیمە و دەستکەوتی شەڕەکانمان. وازتان لێ ناهێنین تا دەتانکەین بە موسڵمان. یان بە سەرشۆریەوە ،جزیەمان دەدەنێ. ئەگەر ڕازیش نابن بە جزیە؟ ئەوا شەڕتا لەگەڵ دەکەین. گەنجەکانتان بێ سەر دەکەین و ژن و ماڵ و منداڵتان دەبەین بۆ خۆمان. حوکمی اڵلەتان لەسەر جێبەجی دەکەین.
نامەکەیان پێچایەوە و دایان بە یەکێک لە خەڵکی میرزا ڕۆستەم، کە لەگەڵ خۆیاندا هێنابوویان کە کەمێک فێری عەرەبی ببوو نامەکیان دایەو ناردیان بۆ لای فروخ پاشا.

سەرچاوە:

واقدي

كتاب فتوح العراق

كتاب فتح العجم

ئەنفالی کوردان لەژێر سێبەری شمشێردا.

بەشی هەشتەم

ئیمام واقدی ئەم مێژوە وا دەگێرێتەوە

نامەبەرەکەی ئاوایی ڕۆستەم نامەکەی خالیدی هەڵ گرت وروولە قەڵا سەختەکەی فروخ پاشا کەوتە ڕێ پاش شەورۆژێک گەشتە دامێنی قەڵاکە کۆمەڵێ پاسەوان خەریک بوو تیر بارانی بکەن هاواری کرد من بەتەنها نامەبەرم لەلایەن عەرەبەکانەوە هاتووم نامەم پێ یە بۆ میر.
ئیترتیرئەندازەکان دەستیان ڕاگرت نامە بەرەکە چوە بن دیواری قەڵاکە لەسەرەوە گوریسێکیان بۆ هەڵدایە خوارەوە ئەویش لە بن باڵی خۆی گرێی داوئەوانیش ڕایان کێشا بۆ سەرەوە بردیان بۆلای پاشا ئەویش تۆزێک تێی ڕاما پێی ووت: ناشرین بووی. شێوەی عەرەبت گرتوە. پێم ناڵێی بۆ لەنەتەوەی خۆت هەڵگەڕاویتەوە و چویتە باوەشی بەرد پەرستەکان (کەعبە)؟ نامە بەر نەبویتایە ئێستا تەمێم دەکردی.
نامەبەر، ووتی: شەڕی عەرەبمان پێ ناکرا میرم. ئەوان زۆروئێمە کەم. فروخ پاشا نوسەرەکەی خۆی بانگ کرد، کە ناوی فستور بوو. زمانی عەرەبی بەباشی دەزانی. چەند جارێک لەگەڵ بازرگانەکان چووبووە ناوچەی عەرەب نشینەکان و لەوێ فێری زمانی عەرەبی ببوو. تەواو شارەزای کولتوری عەرەب بوو. فروخ پاشا داوای لێکرد کە نامەکەی تێ گەیەنێت کاتێک لە ناوەڕۆکی نامەکە گەشت تەواو تورە بو.و وەک ورچێکی بریندار دەی بۆڵاندوو بە ناو دیوەخانەکەیدا دەهات و دەچوو. پاشان ووتی: نامەیەک بنووسە بەناوی ئاهورامەزداوە. بەو عەرەبانە بڵێ، ئێمە وە سوپای رۆم و سوپای فارس نین ئایا عەرەب ئەزانێ نە سوپای فارس و نە سوپای ڕۆم لە وولاتی کوردا نەحەساوەتەوە تا ئێستا عەرەبی سەحرا نشین لێی بحەسێنەوە وا لەشکریان هێناوەتە سەرمان و ڕەشە کوژی وتالان و پرۆ دەکات بەناوی بڵاوکردنەوەی خوا پەرستی؟
فروخ پاشا ئاماژە دەدات بەوئایەتە کە خالید لە نامەکەیدا نوسی بوی وەک پشتگیری اڵلە لە داگیرکاریەکە قَاتِلُوا الَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِاللَّـهِ وَلَا بِالْيَوْمِ الْآخِرِ وَلَا يُحَرِّمُونَ مَا حَرَّمَ اللَّـهُ وَرَسُولُهُ وَلَا

يَدِينُونَ دِينَ الْحَقِّ مِنَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ حَتَّىٰ يُعْطُوا الْجِزْيَةَ عَن يَدٍ وَهُمْ صَاغِرُونَ ﴿٢٩﴾ ووتی اللە کێ یە ڕێ دەدات کوشتن وپڕینی بۆبکرێت و ماڵی خەڵکی بۆتاڵان بکرێت؟ ئەمە دەبێت ئەهریمەن بێت(شەیتان). بنوسە، ئێمە ئاهورامەزدا پەرستین خوای ئێمە، هەرگیز ڕێ بە خراپەکاری نادات. خوێن ڕشتنی پێ حەرامە. ئێستا بەرگری کارین نەک شەڕکەر. ئێوە ڕێگەی شەڕمان نیشان دەدەن. هەزاران ساڵە باوباپیرانمان تاک پەرست بوون. تازە عەرەب هاتووە فێری تاک پەرستیمان دەکەن! ئەگەر نا، دەبێت لە ماڵی خۆمدا سەرانە بدەم ئەگەر ڕازیش نەبم ڕەشە کوژمان دەکەن. بابزانێت، ئێمە، ئامادەین بۆشەڕ. جەنگاوەرەکانم هەرگیزلەشەڕ هەڵنایەن. کوری شاخن. قەڵای سەختمان هەیە لەسەر شاخەکانە. هەرگیز عەرەبی شاخ نەدیو ناتوانن زەفەری پێ بهێنن. ئەگەر لە قەڵاکەم بێمەدەر، ئەوا سەردارەکانیان دەکوژم. سوپاکەیان تەفرو تونا دەکەم. هەرچی تاڵانی ووڵاتانە لێیان دەسێنمەوە. ئەگەر ڕقم هە ستێنن بەهەرچی پیرۆزیە خەلیفەکەیان دەکوژم (عمری کوری خەتاب) مەکەو مەدینە وێران دەکەم. کەعبەی بت خانە دەڕوخێنم. با بەهیچ جۆرێک بیر لەشەڕ نەکەنەوە لە گەڵ ئێمە، بێ وەی ووڵاتی کوردان جێ بهێڵن.
نامەیەیان پێچایەوە و دایانە دەست نامەبەرەکە. ئەویش بەڕێکەوت بەرەو سوپای عەرەب. پاش ماوەیەکی زۆر گەشتە خالیدی کوری وەلید. نامەکەی دایە دەستی. خالید، زۆر تورە بوو و ووتی دەبێت کارێکتان پێ بکەم منداڵ لەسکی دایکیا لەترسا ڕۆحی دەرچێت.
پاش چەند ڕۆژێک فروخ پاشا، ناردی بەشوێن فستوردا و پێی ووت برۆ بۆلای سەرداری عەرەب و پیی بڵێت کە ووڵاتەکەمان جێ بێڵت هیچ هەقێکیان لەسەرمان نیە. ئەگەرنەڕۆن کارێکی زۆر خراپیان بەسەر دێنم.
فستور، کەوتەڕێ. کاتێ گەشتە سوپای ئیسلام خەریکی خۆکۆکردنە و بارکردن بوون. فستور چووە لای خالید و قسەکانی فروخ پاشای هەمووی پێ ڕاگەیاند. خالید، بە فستوری ووت: وا هەست دەکەم تۆ بەفێڵ هاتووی بۆ گەشتن بە زانیاری دەربارەی سوپای ئێمە. فستور، ووتی شتی وانیە. من تەنها پەیامی میرم بۆ هێناوی. خالید بە پێکەنینەوە ووتی: پرۆ بە پاشا ئاگرپەرستەکەت بڵێ، قسەی بێ مەعنا نەکات ئەو هەموو شارو دێهاتەم کاول کردوە ئایا نابێ بەوانەیەک بۆ فروخ پاشا؟ سوێند بە رەبی کەعبە، شەڕی لەگەڵ دەکەم. هەرچی گەنجیان هەیە دەبێت لەخوێنیاندا بگەوزێن. ژن و ماڵیشیان بە غەنیمە دەبەم.
فستور، گەڕایەوە. لەو بەینەدا بێسەرو شوێن کرا. مێژوونوس دەڵێت: فروخ پاشا کوشتی لەبەرئەوی شکی جاسوسی لێکردوە؟
سوپای ئیسلام کەوتە ڕێ. بەرەودێی( سنجان) کە ئێستا پێی دەڵێن سیناجیان. ئەمانیش ڕازی بوون بە جزیەدان. لەبەرئەوەی لەتواناایاندا نەبوو بەرگری لەخۆیان بکەن. خالید، فەرمانی کرد دێی سیناجیان دەبێت هەموو سەرانە بدەن تەنها سواڵکەر سەرانەی ناکەوێت. هەروەها دەبێ خواردنی خۆیان و ئالیکی ئەسپەکانیان بدەن. ئەو شەوە لەو ئاواییە مانەوە و بەیانی زوو خالید بانگی عبداڵلەی عمری کرد و پێی ووت: هەزار سوارە بەرەو پرۆ سەر ڕێگای پشتدەر. هەرچیت هاتە ڕێ تاڵانی بکە. خواردەمەنی و کەلوپەلی سەربازەکانت دەستە بەربکە. بانگی مقدادی ئەسوەدی کرد و فەرمانی پێکرد کە هێزکی باش بەرێت و پروات بۆ تاڵان کردنی(شارەستین)بۆدابین کردنی ئازوقە بۆ خۆیان و ئەسپەکانیان.
خالیدی کوری وەلید چەن یەکەیەکی سەربازیشی ڕەوانەکرد کە پێش ڕەوی سوپا زەبەلاحکە بکەن شووێن و ڕێیان بۆ ئامادەبکەن ئاگاداریشیان بکەنەوە لە جموجۆڵی سەربازەکانی فروخ پاشا.
خالید، لەگەڵ فەزلی عباس و زوبیری عەوام و زرای ئەزور و عبدالرحمانی ئەبو بکری سدیق و عبداڵلە ئەیوب، سواری ئەسپەکانیان بوون ڕووە و مەرگە، کاتێ فروخ پاشا بەمەی زانی دەڵێن دەستی کرد بە شەراب خواردنەوە تاتەواو سەر خۆش بوو وتی زرێ پۆشەکەم بۆ بێنن ئێستا شەڕ خۆشە.

سەرچاوە:
واقدي
كتاب فتوح العراق
كتاب فتح العجم
واقیدی
ناوی موحەمەد کوری عومەری واقیدی یە لە ساڵی ١٣٠ کۆچی دا لە شاری مەککە لەدایک بوە لە بەغداد کۆچی دوایی کردوە زۆر کتێبی نوسیوە لە سەر داگیرکاریەکانی ئیسلام لە ئەسکندریە ئەرمەنستان و وولاتی بەینی ڕووبارو.وولاتی عەجەم وخۆراسان ووداگیر کردنی ئەفەریقا و داگیر کردنی زەویە بە پیتەکانی عێراق و شام. وجزیرە .داگیر کردنی کوردستان دەست نوسێکی واقیدی بوە بەناوی (فتوح سواد العراق) لەماڵی مەلا عەبدول سەمەد لە مەرگە تاکە نوسخەیە ،ئەو نوسخەیە یەک بەرگی لە سەر ئاگاداری شێخ ئەمین بێژەی لە بەری گیراوەتەوە دوای چەند نوسخەیەکی تریشی لەبەر گیراوەتەوە .دوایی محمد تەوەکولی داوا لە مەلا عەبدولعەزیزواعیزی سەردەشتی دەکات کە هەمووی لە عەرەبیەوە وەگێرێتە سەر فارسی ئێستا نوسخە ئەسڵیەکەی لای نەوەی شێخ محمد ئەمینە .عەبدولعەزیز واعیزی سەردەشتی (لە ساڵی١٨٩٥ لەکۆیە لەدایک بوە دوایی بۆ مەلایەتی چوە بۆ سەردەشت٦٧ بڵاوکراوەی تری هەیە . (
هەروەها مەلا ڕەووف سەلیم حوێزی هەمان دەست نووس ساڵی١٩٧٠ بە ناوی کوردستان وئاینی ئیسلام ی بڵاو کردەوە بە دوو بەش لەیەک کتێب دا بەشێکیان بە هۆنراوە بەشی دووەم گێرانەوەی ئەو مێژووە بە نوسین (کوردیەکی کۆن زمانی مەلا) بەڵام ئێستا نە لە کتێبخانەکان و نە لە بازاڕەکاندا دەست دەکەوێت لەوە دەچێت قەدەغە کرابێت
مەلا ڕەووف سەلیم حوێزی ١٩٠٨ لە کۆیە لەدایک بوە چەند بەرهەمێکی تری هەیە.

ئەنفالی کوردان لەژێر سێبەری شمشێردا

بەشی نۆیەم

پاش ئەوەی پیرانی زەردەشتی، دەستیان کرد بە نزاکردن و پارانەوە لە خودا، تاکو وولاتی کورد، دوور بێت لە شەڕو بەڵا. بەڵام، نزاو پاڕانەوە بێ سود بوو. دوژمن لەدەرگای ماڵەکەیان دەدات و سوپای عەرەب، نزیک بوونەوە و ڕیزی شە ڕیان بەستبوو. سوارە، بەجیا و پیادە بە جیا، خۆیان بۆ جەنگێکی بەربڵاو و ترسناك لەدژی کوردان، ئامادەکرد.
فروخ پاشا، سوپاکەی کە پێک هاتبوو لە ٥٠٠٠( پێنج هەزار) سوارە، پاش سەردانی پەرستگاکەیان و نزاکردن، هەموویانی کۆکردەوە و ووتی: ڕاستە کە دینەکەمان ڕێگەی شەڕکردنمان پیشان نادات و بەکاری ئەهریمەنی دەزانێت. چونکە ئێمە، لەسەرمانە کە بە(بیری چاک وتەی چاک وکرداری چاک ) هەڵسوکەوت بکەین. بەڵام، ئەمرۆ، دوژمنەکەمان لەو زمانە تێناگات و هاتووە خۆمان بکوژێت و کچ و ژنەکامان بکەن بە کەنیزە و کورەکانمان وەغولام و کۆیلە و ماڵمان وەک تالانی شەڕ بەرێت. بۆیە داواتان لێدەکەم ئەمرۆ هونەری خۆتان بنوێنن. ئەمرۆ شەرەف و ناموسی خۆتان لەدەست مەدەن. نیشتمان و وولاتی خۆتان بپارێزن. تا پیشانی عەرەبی بدەین ئێمە کێین!
فروخ پاشا، لەقسەکانی بۆوەو دەرگای قەڵا کرایەوە٥٠٠٠پاڵەوانی کورد، ریزی جەنگیان بەست.

فروخ پاشا، داوای لە تیر هاوێژەکانی سەر قەڵاکەی کرد، تەواو ئامادەبن و دوژمن لە دەستیان دەرباز نەبێت. وانەیەکی باشی خالیدو سوپاکەی دابدەن.
لە بەرامبەرئەوانیش، سوپای عەرەبی موسڵمان، وەستابوو. خالیدی کوری وەلید، بە سواری ئەسپەکەیەوە دەهات و دەچوو. هاواری دەکرد( إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلَّذِينَ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِهِۦ صَفّٗا كَأَنَّهُم بُنۡيَٰنٞ مَّرۡصُوصٞ(الصف ٤) واتا (اڵله، ئەوانەی خۆش دەوێت بەریز وەک دیوارێکی پتەو لەپێناویدا کوشتار دەکەن،) ئەمە فەرمانی اڵلەیە. هەر کەس لە فەرمانی اڵله دەرچێت جێگەی جەهەنەمە کەئەوەش خراپترین جێگەیە دەبێت سەرکەوتوبن. اڵلەتان لەگەڵە. ئەمانە کافرن. سەرو ماڵیان حەڵالی ئێوەیە. ئەوەتا اڵله پێتان دەڵێت ( فَكُلُواْ مِمَّا غَنِمْتُمْ حَلاَلاً طَيِّبًا وَاتَّقُواْ اللّهَ إِنَّ اللّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ سورەتی ئەنفال﴿٦٩﴾ ئیتر چاوەڕێی چی دەکەن؟ پەلاماریان بدەن و سەروەتڤو سامانی چەند ساڵەیان چاوەڕێی دەستی ئێوەیە.
دەنگی اڵله اکبر، لە هەموو لایەکەوە بەرز بۆوە. هێرش کردن بۆسەر سوپای کورد دەستی پێکرد. واقدی، دەڵێت: لە پێشا سوپای فروخ پاشا، لە جێگەی خۆیان وەک بەرد چەقیبوون و نەدەجووڵان. تاکو سوپای عەربی ئیسلام نزیک بۆوە. فروخ پاشا، هاتە پێشی سوپاکەی و فەرمانی کرد بەسوپاکەی دا، بۆ هێرش بردن. جەنگێکی گەورەی خوێناوی ڕویدا. هەر لە دەستپێکی شەڕەکەدا زانیم کارەسات دەقومێ. تیرهاوێژە کوردەکان، بەهونەری شە ڕکردنیان، زۆر سەرسامیان کردم. ئەو میدانە، سوور ببو بە خوێنی هەزارەها عەرەبی موسڵمان. ئینجا پێمان زانی بۆ کوردەکان نە دەجوڵان! بۆ ئەوەی سوپاکەمان بخەنە داوی تیرئەندازەکانیانەوە.
کاتێ بە خۆمان زانی لە پاڵ هەموو بەردێک و سەرلقی دارێک، تیرمان بۆ ئەهات. بە جۆرێک بوو فریای پاشەکشە نەدەکەوتین. سوپای ئیسلام لەو شەڕەدا هەڵهات. هەرچەندە خالید کوری وەلید، کەوتە هاوار کردن بۆئەوەی ورەی سەربازەکانی بەرز کاتەوە و دەی ووت: ئەی پاڵەوانانی عەرەب، ئێوە اڵلەتان لەگەڵدایە. پشت مەکەنە دوژمن! هەڵمەت بەرن چۆن ئەم شەرمەزاریەتان پێ قبوڵ دەکرێت؟ ئەم جەنگە غەنیمەتە لەدنیاو قیامەت. اڵله، پاداشتی ئەوانە ئەداتەوە کەلە پێناویدا سەروماڵ دەبەخش.
خالید، لەم قسانەدا بوو، پاڵەوانێکی کورد، وەکوشێرهێرشی کردە سەرخالید. شەڕێکی بێ وێنە، لە نێوانیاندا ڕوویدا. تا خالید شمشێرێکی دا لەسەری کوردەکە. بەڵام، لەبەر ئەوەی کوردەکە کڵاوێکی ئاسنی لەسەردابوو نەیبری. شمشێرەکەی خالید پسا. کورەدەکە، پەلاماری خالیدی داو توانیی بریندار بکات. بەڵام خالید، توانی بە مست هەرچی پەراسوی کوردەکەیە بشکێنێ وبیکوژێت!
خالید، کەوتە سەر پێ و هاواری کرداڵله اکبر. بەڵام، سەربازەکانی هەرهەڵ دەهاتن. کە ئەمەی بینی، زۆر دڵ تەنگ بوو. سەیری کرد لە هەرچوارلاوە هێرش کراوەتە سەریان و وەخت بوو بەدیل بگیرێت. هەرچۆنێک بوو بەیارمەتی هاوەڵەکانی توانی خۆی دەربازبکات و لەمیدانی شەڕ دورکەوتنەوە.
ئەوشەوە، میدانی شەرەکە ببوو بەجێگەی دڕندە کێویەکان کەهاتبوون بۆ خواردنی لاشەی کوژراوەکان. ئیمام واقدی ،دەڵێت: ئەو شەوە لە سەربازگەکە کەس نەی دەتوانی چاو لێک بنێ لە ترسی دوژمن. نەوەک لەپرهەڵکوتنە سەرمان. لە هاوارو ناڵەی برینداەرکان یەکێک دەست پەریبو ئەویتر قاچی و یەکێکی تر چاوی کوێر ببوو. کۆمەڵکی تر، سەریان شکابوو. زۆربەی بریندارەکان برینداری تیرەکان بوون. ماوەی چەند ڕۆژێک لە سەربازگەکەماندا ماینەوە تا توانیمان ریزەکانی سوپاکەمان ڕێک بخەینەوە. لەوماوەیەدا ئەو هێزانەی لەو ناوەدا بڵاوەمان پێکردبوون بۆکۆکردنەوەی غەنیمە، بانگ مان کردنەوە. لەوانە، عبداڵله کوری خەلیفە عمر. کە هاتەوە چووە لای خالید. دەستکەوتی زۆری هێنابوو و ووتی: هەر کە لە ئێوە جیا بوومەوە چوومە سەر ڕێگای پشتدەر. سەیرم کرد ئاواییەکانی ئەوناوە هەموویان چۆڵیان کردوە و لەترسا ڕایان کردبووە سەرشاخەکان. منیش، دوایان کەوتم. چی ببینم! ئەوخەڵکە زۆربەیان هەرچی هەیان بوو،

لەگەڵ خۆیان هەڵیان گرتبوو. هەموو مەڕ و ماڵاتەکەشیان دابووە پێش خۆیان. بۆم دەرکەوت ئەمانە خەڵکی ئاوایی سیدەرەن و بێ چەک بوون. هێرشمان کردە سەریان و هەموو پیاوەکانمان کوشت و دەستمان گرت بەسەر ماڵ و منالەکانیان.
خالید، کە ئەمەی بیست، زۆر دڵخۆش بوو بەو دەستکەوتە زۆر و زەبەندەیە. ووتی: اللّه، دەڵێ (واعلموا أنما غنمتم من شيء فأن لّله خمسه ولّلرسول ولذي القربى واليتامى والمساكين وابن السبيل )واتا هەرچیەکتان دەست کەوت لە تالآنی، پێج یەکی بۆ اللّه و محمد و خزمان و هەتیوان و هە ژاران، ئەوانەی لەڕێگا ماون.
خالید، کەوتە دابەشکردنی تالآنیەکان. بەشی خواو محمدیان لێ جیاکردەوە و ئەوەی مایەوە لە کوروکچ و منداڵ و خواردەمەنی و ئاژەڵ، دابەشی کرد بەسەریانا. بەشی خۆشی هەڵگرت.
هەروەها مقدادی ئەسوەد هەڵی کوتایە سەر دێی شارەستین و شەڕێکی گەورە ڕویدا. لەو دێیە زۆریان لەیەکتر کوشت. ئەم شەڕە، شەورۆژێکی خایاند. مقداد، بەوە ناوبانگی دەرکردبوو کە دەست لەمنداڵی ناو بێشکەش ناپارێزێ. بۆیە فەرمانی کرد دەبێت هەموویان بکوژرێن.
لەبەر ئەوەی شمشێریان لەڕویاندا هەڵ کێشاوە. لەئەنجامدا ڕەشە کوژی دێی شارەستێن کرا. هەرچی هەیان بوو تاڵان کرا و کرا بە غەنیمەی شەڕ. دێکەشیان سوتان و کەلاوە ڕوخاوەکانیشیان سپارد بە لاشە ساردبووەکان. مقداد، ووتی، دەبێت بکرێن بە پەند لە ناوچەکەدا، تاکەس نەوێرێت شمشێر بەرز بکاتەوە لە ڕوی سوپای عەرەبی موسڵمان.
ئەمانیش، بەتاڵانیەکی باشەوە گەڕانەوە بۆلای خالید. خالیدش، بەشی اللّەو محمدی جیاکردەوە و ئەوەی کەمابوو دابەشی کرد بەسەریانا. کچە جوانەکانیش، دەدران بە سەحابەکان وەک کەنیزە

سەرچاوەکان:

واقدي

كتاب فتوح العراق

كتاب فتح العجم

ئەنفالی کوردان لەژێر سێبەری شمشێردا.

بەشی دەیەم

واقدی ئەم مێژووە ئاوا دەگێڕێتەوە:

خالیدی کوری وەلید، کاتێ چاوی کەوت بە عبیداڵلەکوری عومەری خەتاب و مقدادی ئەسوەد کەئەوهەموو (غەنیمەیە) تالآنی شەڕیان لەگەڵ خۆیاندا هێنابوو، زۆر دڵ خۆش بوو. هێز و توانایەکی بەبەردا گەڕایەوە، پاش ئەو شکستە گەورەیەی، کە دە بەرامبەر فروخ پاشادا بەسەریان هاتبوو. خێرا، کەوتە دابەشکردنی دەستکەوتەکانی تاڵانکاریەکە. لە ناو دەستکەوتەکانیاندا کچ و کوری منداڵکاریشی تیادابوو. وەک دەستکەوتی شەڕ دابەشی کردن بەسەر سەرکردەکاندا. هەروەها پێنج یەکی دەست کەوتەکان ڕەوانە دەکرا بۆ خەلیفە عومەر و ئەویش دەی کردە بەیت ومال و دوایی دابەشی دەکرد بەسەر عەرەبەکانی مەکەو مەدینەدا.

واقدی نوسیویەتی: خالید فەرمانی کرد بە سەربازەکانی، کە ماوەیەک بوو لەلای ئاوایی سنجان، کە لەنزیک (شاری سلیمانیە. ز) بارگەیان خستبوو، خۆیان کۆکەنەوە و ئامادەبن بۆهێرشکردنە سەر سوپاکەی فروخ پاشا. سوپای ئیسلام دووای فەرمانەکەی خالید خۆیان کۆکردەوە و بەرەو قەڵاکەی فروخ پاشا کەوتینە ڕێ. لەوێ ڕیزی شەڕیان بەست. هەرچەندە ڕۆژێک پێش شەڕەکە خالید چەند نامەیەکی نوسیبوو بۆ دانیشتوانی قەڵاکە و داوای لێکردبوون

کە خۆیان بدەن بەدەستەوە و لەگەڵ سوپای عەرەبی موسڵمان دژی میرەکەیان شەربکەن و دەرگای قەڵاکە بکەنەوە، ئەگەر وانەکەن ڕەشە کوژدەکرێن و سەرو ماڵیان دەبێت بەدەست کەوتی شەڕ! ئەم نامانە درا بە تیرهاوێژەکان و ئەوانیش هەڵیان دایە ناو قەڵاکەوە، بەڵام بێ وەڵام بوو.

واقدی دەڵێت: خالید لەپێشی سوپاکەی دەهات و دەچوو. کەمێک شپرزەیی پێوە دیار بوو. هاواری دەکردو دەی ووت: سوپای عەرەب؛ (دەڵێن بۆیەوای دە ووت بۆ ئەوەی هەستی نەتەوایەتییان بجوڵێنێ) بەڵای خوام لێدان، ئاخر ئێوە کەی لەشەڕ ڕاتانکردووە؟ تا لەبەر سوپای کورد ڕاکەن و پشت لەشەڕکەن!؟ ئێوەی عەرەب سوپای کسرا و ڕۆمتان شکاند، ئەمڕۆ دەمەوێ بتان بینم، کە چۆن سوپای کورد بەدەردی سوپای ڕۆم و کسرا دەبەن و سەروماڵیان تاڵان دەکەن. بەم ئایەتە کۆتایی بەقسەکانی هێنا (قَاتِلُوهُمْ يُعَذِّبْهُمْ اللَّهُ بِأَيْدِيكُمْ وَيُخْزِهِمْ وَيَنْصُرْكُمْ عَلَيْهِمْ وَيَشْفِ صُدُورَ قَوْمٍ مُؤْمِنِينَ ) سورة التوبة الاية رقم(١٤) واتا: لەگەڵیان بجەنگن اڵلەش بەدەستی ئێوە ئازاریان دەدات و پەستیان دەکات. یارمەتی ئێوە دەدا تا زاڵبن بەسەریاندا و دڵ ودەرونی هۆزی بڕواداران شیفا ئەدات.

واقدی دەنوسێت: خالید لەقسەکانی بۆوە و یەکسەر هێرشی برد. لە بەرامبەریان سوپای کورد بەهەمان شێوە ریزی شەریان بەستبوو. سوپاکەیان هەموویان زرێ پۆش بوون. هەر وەکو زنجیری ئاسن بەیەکەوە ئاڵابوون. لەسەر قەڵاکەیان ئاگری پیرۆز لەکڵپە و جۆشدابوو. دەنگی دەهۆڵەکانیان ئەوناوەی هێنابووە جۆش. فروخ پاشا لە ڕیزی پێشەوە بە ئەسپەکەیەوە دەهات و دەچوو و قسەی بۆدەکردن. هێزوتوانای دەکرد بەبەر سەربازەکانیدا.

شەڕ دەستی پێکرد. بەڵام چۆن شەڕێك! مەیدانی جەنگەکە بە لاشەی کوژراوەکان داپۆشرابوو. تیرهاوێژە کوردەکان ئاسمانیان چنی بوو بە تیرەکانیان تەواو بێزاریان کردبووین. لەبەر ئەوەی بەرزایەکانیان لێگرتبووین، نەمان دەتوانی زاڵبین بەسەریاندا. کۆمەڵێک بە
بەردەقانێ(قۆچەقانێ) بەردیان تێ دەگرتین کە دەست و قاچ و سەریان دەشکاندین. بە بەردەکانیان ژمارەیەکی زۆرمان لێ کوژرا. بۆیە دووبارە پاشەکشەمان کرد.

لەدووای پاشەکشەکە، خالید فەرمانی کرد بە زرێ پۆشەکان، بە خۆیان و قەڵغانەکانیان هێرش بەرن و بەدوایاندا تیر هاوێژەکان دەستی خۆیان بوەشێنن. دووابەدوای ئەوان هێرشێکی سەرتاسەری بکرێتە سەریان لە هەموو قوڵەکانەوە. هێرش، دەستی پێکردەوە. ئەم جارە سوپای عەرەب توانی نزیکی قەڵاکە ببێتەوە، بەڵام ئەوەی سەیر بوو بەلامانەوە سەربازە کوردەکان وەک ڕم چەقیبوون. جێگەی خۆیان چۆڵ نەدەکرد. شەڕکەرێکی زۆر بەتوانابوون. شەڕیان دەکرد هەتا دەکوژران. خالید بەڕاست و چەپدا شمشێری دەوەشاند و ملی دەپەڕاند. اڵلەاکبری دەوت. لەناکاو توشی بوو بە توشی پاڵەوانێکی بەناوبانگی کوردوە کەناوی گڕگڕ بوو. زۆر بەتوانابوو لە هونەری شەڕکردن. زۆری لەسوپای موسڵمان کوشتبوو و توانیی خالید هیلاك بکات و شمشێرەکەی لەدەست بخات. هەڵی کوتایە سەرخالید و ئاوەزنگی ئەسپەکەی لە گەڵ ئەسپەکەی خالید جووت کرد. کەوتنە شەرە مست؟ خالید زینی ئەسپەکەی ڕاکێشاو پچرانی. گڕگڕە کەوتەخوارەوە. خالید پەلاماری شمشێرەکەی ئەوی داو توانی گڕگڕ بکوژێت . نیوەڕۆ بوو. شەڕ هەر بەردەوام بوو. کوژراو و برینداریێکی بێ یەکجار زۆر هەبوو لە هەردوو لا. شمشێرەکانی خالیدو فەزلی ابن عباس وعبداڵلای ئەیوب و زراری ئەزور عبدولرحمان خوێنیان لێ دەچۆڕا. شەڕ هەربەردەوام بوو تا فروخ پاشا فەرمانی کرد پاشەکشە بکەن و بگەڕێنەوە ناو قەڵا. سوپای عەرەبی موسڵمان کاتێک بەمەیان زانی دوایان کەوتن هەتا نزیک قەڵاکەیان. بەڵام تیرئەندازەکان تیر بارانیان کردن و ناچار سوپاکە پاشەکشەیان کرد. بەشێک لە سوپای کورد سەرکەوتنە سەر شاخەکە. زرار بن ئەزور بە سوپایەکەوە دوایان کەوت. بەڵام نەی توانی سەرکەوێت بەسەریاندا. لەبەر ئەوە ئەوان لە بەرزی بوون و بە تیرو ڕم و بەرد بە گژ سوپاکەی زراردا چونەوە. زۆریان لێ کوشتن و زرار ناچار بوو پاشە کشە بکات.

سوپاکەی خالید برینداره‌کانیان کۆکردەوە و کوژراوەکانیش هەر لەوێدا بە جل و بەرگەکانیانەوە نێژران و دوایی گەڕانەوە سەربازگەکەیان. خالید ڕوی کردە هاوەڵەکانی و ووتی: ئەوچێژەی خەڵك لەخواردنەوەی مەی هەستی پێدەکەن، من لە کاتی خوێن ڕشتندا هەستی پێدەکەم. ئەمڕۆ، کاتێ سەرم دەپەڕاند و خوێن فوارەی دەکرد، تەواو سەرمەستی خۆشی دەبووم. چێژم وەردەگرت. مقداد دەڵێت: منیش هەمان هەستم هەبوو.

من بە باشی دەزانم مقدادی ئەسودتان پێ بناسێنم: مقداد کوری عمروثعلبة. باوکی یەکێک دەکوژێت لە خێڵەکەی خۆیان و ناچار پەنا دەباتە بەر هۆزی کندی. باوکی لە هۆزی کندی ژن دەهێنێت و مقداد لەدایک دەبێت. لەوێ مقداد توشی شەڕ دەبێت لەگەڵ یەکێک لە گەورەپیاوانی ئەوخێڵە بەناوی أبي شمر بن حجر الكندي. شمشێرێک دەدات لە قاچەکانی و ڕادەکات بۆ مەککە و لەوێ پەنا دەبات بۆپیاوێکی بەدەسەڵاتی چاونەترس بەناوی الأسود بن عبد يغوث الزهري. ئەویش پەنای دەدات. دەبێت بەکۆیلەی و نازناوی ئەسود لە خاوەنەکەیەوە وەردەگرێت. ئەم پیاوە، زۆر بێ بەزەیی بووە بەرامبەر بە مقداد. بۆیە مقداد، کاتێ موسڵمان بوو نەی وێرا لای کەس باسی بکات. لەبەرئەوەی خاوەنەکەی دوژمنێکی سەرسەختی محمد بوو. دەڵێن، موسڵمان بوونی مقداد بەهۆی زەبروزەنگی الأسود بن عبد يغوث الزهري خاوەنەکەیەوە بووە. بۆیە لەفرسەتێکدا ڕادەکات لەدەستی و دەڕوات بۆ مەدینە. مقداد لە ٧موسڵمانە کانی یەکەم بووە. یەکەم سوارەی موسڵمان بووە بەشداریی هەمووشەڕەکانی کردووە. هەتابە پیریش هەر کە وتوویانە کێ دەچێت بۆشەڕ؟ مقداد یەکەم کەس ئامادە بووە. سی ساڵی تەمەنی لە شەڕی وولاتاندا بردۆتەسەر و بەشداری شەڕی (فارس و رۆم وعێراق و کوردستان وئازەربینجان)ی کردووە. دەستی سوور بووە بەخوێنی هەزارەها مرۆڤ. جارێک غەیرە مسوڵمانێك دەگرێت و دەستێکی دەبڕێت. کابرا لەدەستی ڕادەکات و بە محمد دەڵێت: کافرەکە ڕای کرد. بڕۆم بیگرمەوە و سەری ببڕم؟ محمد دەڵێت: نا وازی لێ بێنە.

میقداد چارەی ئەبوبەکری سدیقی نەویستووە. بەیعەتی نەیاوەتێ. زۆر دڵسۆی عەلی بووە. میقداد داوای کچەکەی عبدالرحمانی بن عوف دەکات کە (یاوەری محەمەد بووە) ئەویش دەری دەکات. لەبەر ئەوەی مقداد کۆیلە بووە بەهاوشانی خۆی نازانێ و دەچێت شکاتی لێدەکات لای محەمەد. ئەویش کچی مامی خۆی دەداتێ بەناوی (ضباعە کچ زبیرکوری عبدمطلب). محەمەد دەڵێت: اڵلە ئەمری پێ کردووم کە چوار کەسم خۆش بوێت. مقداد یەکێکە لەوانە. کاتێ کۆچ دەکات بۆمەدینە لەگەڵ دووکەسی ترلەوێ کەس جێگەیان ناکاتەوە. بۆیە محمد بە ناچاری دەیان بات بۆماڵی خۆی. محمد چووار بزنی ئەبێت. ئەمانیش بە محمدەوە چووار کەس دەبن. محمد بە مقداد دەڵێ هەموو ڕۆژێک ئەم بزنانە بدۆشە و ڕۆژانە چوار کوپ شیریان هەیە. یەکی کوپێکمان بەردەکەوێت. مقدادیش بە قسەی دەکات و ڕۆژێک محمد درەنگ دێتەوە مقداد شیرەکەی خۆی دەخواتەوە، بەڵام تێر نابێت. تەماح لەبەشەکەی محمدیش دەکات و چۆر لەویش دەبڕێت. دوایی بیری دەکەوێتەوە و دەڵێت خوایە چیم کرد. ئێستا محمد دێتەوە و برسیەتی و هیچ نییە بیخوات! برادەرەکانی دەخەون. ئەمیش لەتەریقیدا نازانێت چی بکات. محمد دێتەوە و ئەڵێت: مقداد کوا بەشە شیرەکەم؟ ئەویش دەڵێت: زۆرم برسی بوو ئەویشم خواردەوە .محمد دەڵێت: گوێی مەدەرێ برۆ چوارکوپی تر شیر بێنە. مقداد ئەڵێ: من خۆم دۆشیومن. دڵۆپەیان تیانەماوە. محمد ئەڵێ تۆبڕۆ بیان دۆشەرەوە. اڵله چوار کوپی تری بۆ ناردووین لە ئاسمانەوە. مقداد دەڕوات چوارکوپی تر شیر دەهێنێ. بەڵام نەیدەزانی چۆن شیر چۆتەوە ناو گوانیان. بەڵام، محەمەد دەیزانی، کەئەو زۆر زوو دۆشیونی و ئێستا گوانیان شیری تێچۆتەوە.

مقداد پشت گیری علی کرد بۆ لەمل دانی عبیداڵلەی عمری ختاب. دژی فەرمان ڕەوایی عوسمان بوو. لەدووای داگیرکاری وولاتان دەوڵەمەندبوو. بەپارەی تاڵانکارییەکان ژمارەیەک کۆیلەی هەبوو.. وابزانم ئێستا مقداد دەناسن. ئەم سەرکردەیە، کە لەشەڕکردن و خوێن ڕشتن

و ڕاوورووت زیاتر هیچیکەی لەهەگبەدا نەبووە. ئێستا هاتووە کوردی زەردەشتی فێری ئاشتی و خۆشەویستی و دەستپاکی بکات. کەبۆماوەی ١٥٠٠ساڵە ووڵاتی کورد، لەسایەی ئاوێستاکەی زەردەشتدا خوێن ڕشتن و دزی و درۆ، بەکاری ئەهریمەن( شەیتان)زانراوە.

سەرچاوەکان:

ابن حجر العسقلاني، الإصابة في تمييز الصحابة، ج٣، ص٤٥٤ ـ٤٥٥.

ابن الأثير، الكامل في التاريخ، ج٢، ص١١و١٥٢؛ وج٣، ص٦٧.

ابن أبي الحديد، شرح النهج، ج١، ص١٧٧ و١٨٦ و١٨٧، و١٩٨، وج٩، ص٥٥ـ٥٧ ؛ وج١٤، ص٢١٧.

المجلسي، البحار، ج٢٠، ص١٤١.

أعلام الورى، ص٢٠٧.

ابن عبد ربه، العقد الفريد، ج٤، ص٢٧٥.

المسعودي، مروج الذهب، ج٢، ص٣٤٤.

ابن قتيبة، الإمامة والسياسة، ج١، ص٣٥.

اليعقوبي، تاريخ اليعقوبي، ج٢، ص١٦٣.

السيرة لابن حبان.

ئەنفالی کوردان لەژێر سێبەری شمشێردا.

بەشی یانزەهەم.

واقدی بەم شێوەیەی خوارەوە، ئەم مێژووە دەگێرێتەوە:
پاش ڕۆژێکی پڕ لە شەڕ و خوێن ڕشتن و سەرکەوتن و شکست هێنان، فروخ پاشا فەرمانی بە سوپاکەیدا، کە پاشەکشە بکەن بۆ ناو قەڵاکەیان.
ئەگەر زیرەکی و لێ هاتویی و ئازایەتی فروخ پاشا نەبوایە، ئەوا هیچ کەسێکی تر نەیدەتوانی بە سوپایەکی کەمەوە بەگژ سوپایەکی زەبەلاحی دڕندەی وەک سوپاکەی عەرەبی ئیسلامیدا بچێتەوە. سوپاکەی فروخ پاشا توانیان بەرگرییەکی بێ وێنە بکەن و زیانێکی گەورە لە سوپاکەی خالید بدەن و مەیدانی شەڕەکە پرکەن لەلاشەی سەربازی کوژراو و بریندار.
فروخ پاشا کەهەستی کرد سوپاکەی لە توانایدا نەماوە، کە بەرگری بکات لە ناو مەیدانی جەنگدا، فەرمانیدا بکشێنەوە. فروخ پاشا دەرکی بەوە کردبوو، کە ئەگەر ئاوا بڕوات، لە نێوان سەرلەشکرەکان و سەربازەکانیدا داپڕان دروستدەبێت. لەبەر ئەوەی سەربازێکی زۆری عەرەبە موسڵمانەکان لە هەمووولایەکەوە هێرشیان دەهێنا و خەریک بوو سەربازە کوردەکان لەناویاندا وون دەبوون. ئەم جۆرە شەڕکردنەش لە بەرژەوەندی سوپاکەی فروخ پاشادا نەبوو، لەبەر ئەوەی تیرهاوێژەکان نەیان دەتوانی ئامانجەکانیان بپێکن.
سوپاکە گوێیان لە دەنگی شەیپور بوو، کەوتنە پاشەکشە و گەڕانەوە ناو قەڵا. بەپەلە هەموو دەروازەکانیان داخست. تیرهاوێژەکان کەوتنە تیر هاوییشتن بۆ دوورخستنەوەی سوپای دوژمن. ئەوانیش پاشەکشەیان کرد بۆ سەربازگەکەیان.
فروخ پاشا دەم و چاوی تورەییەکی زۆری پێوە دیاربوو. کەس نەی دەوێرا قسەی لەگەڵ بکات. زرێ پۆشەکەی هەر لەبەردابوو، کە بەخوێن سواخ درابوو. چووە سەر شورای قەلاکە کە دەڕوانی بەسەر مەیدانی شەڕەکەدا و یبینی مەیدانی شەڕەکە پڕ بووبو لەلاشەی

کوژراوەکان، هەر دەهات و دەچوو و هاواری کرد. دەنگی هاوارەکەی، هەروەک بەردێک هە ڵ دەیتە ناو گۆمێکی مەنگەوە چۆن دەی شڵەقێنێ، ئاوا بەو هاوارە ئەو بێدەنگیەی نەهێشت هەموو شاخ و دۆڵەکانی ئەو دەڤەرە دەنگی دەدایەوە. هاواری کرد  ئاهورامەزدا! پێم بڵێ ئەمە چۆن خوایەکە ئەوەندە تینوی خوێنە؟ ئاهورامەزدا تۆلەکوێی؟ ئەهریمەن لەلای عەرەب ناوی اللەیە و وێران کاری دەوێت. ئەو هەموو لاشە بێ گیانە خوێناویەی دەوێت! ئاهورامەزدا، لێت دەپرسم، خۆ تۆ سەرچاوەی پاکی و جوانی و ڕاستی و چاکەیت. شەڕ لەلای تۆ جێگەی نیە. ئەی ئەم اللەیەی عەرەب، بۆ ئەوەندە پێچەوانەی تۆیە؟ دڵخۆشە کە لەپێناویدا جەنگ دەکرێت و خەڵك دەکوژرێت و ماڵ وێران دەکرێت! اللەکەیان هێندە بودەڵەیە ئەم مرۆڤ کوژانە پارێزگاری لێدەکەن. هاوار بۆ تۆ دەبەم مەزدا ئاهورا، ڕێگەی چاکەم پیشان بدە. خۆمن دەزانم بە پێی ئامۆژگاریەکانت بۆ ڕشتنی خوێنی تەنیا مرۆڤێک ئە وجێگەیە حەوت ساڵی گەرەکە بۆ پاک بوونەوەی. بەڵام ئێستا بە خوێنی هەزاران مرۆڤی بێ تاوان خاکی وولاتەکەم سوور بووە. بۆئەم هەموو خوێن ڕشتنە و پاک بونەوەی خاک، پێم ناڵیی چەند ساڵی ئەوێ؟ ئای خوایە! بۆنی خوێن و تاوان کوشتمی.
فروخ پاشا لەم قسانەدا بوو، لەپڕ هاوار و ڕۆڕۆی دایکان و باوکانی جگەر سوتاو، کە بێ ئومێد ببوون لە هاتنەوەی کورەکانیان، بەرز بۆوە. ئەمە فروخ پاشای ڕاچڵەکاند و فەرمانی دا، هەر لەگەڵ ڕۆژئاوابوندا، چەند یەکەیەکی سەربازی لەگەڵ کەسوکاری کوژراوەکاندا بڕۆن لاشەی خۆشەویستانیان بێنەوە.
بۆ ڕۆژی دواتر، فەرمانی دا هەموو کار بەدەستەکانی کۆببنەوە. کاتێ هاتن. فروخ پاشا ووتی: خۆتان دەزانن سەربازانی عەرەب چەند بەرابەری ئێمەن و لەتوانای ئێمەدا نەماوە بەرگری بکەین. من وای بە باش دەزانم بکشێینەوە و قەڵاکە چۆڵ بکەین.
هەندێک لە بەرپرسەکان، ووتیان: ئێمەش هاوراین لە گەڵ تۆ. فروخ پاشا تۆزێك تێیان ڕاما و ئینجا ووتی: من ویستم تاقیتان بکەمەوە. من دەجەنگم هەتا دەکوژرێم.
یەکێک لەوەزیرەکانی ووتی: گەورەم جەنگاوەری تەواومان لەبەردەستدا نیە بۆ بەرەنگاربوونەوە. ئەو نامانەش کەناردمان بۆ میرەکان، تا هاوکاریمان بکەن، بێ ئەنجام بوون.
فروخ پاشا تەواو بێتاقەت بوو. لەم قسانەدا بوون، یەکێ بەناوی (هورمز)ەوە هاتەلای فروخ پاشا و پێ ووت: میرم، دوێنێ (پیرۆتی کوری بەهرام ) بەمن و دەکەسی خزمی خۆی ووت، بچین بۆلای سوپا سالاری عەرەب و بزانین مەرجیان چیە؟ ئەوەبوو ڕۆیشتین. لەوێ، خالید سێ مەرجی دانا بۆمان. یان موسڵمان بوون، یان جزیەدان، یان شەڕ و کوشتار و دۆراندنی ئازادی (بە کۆیلە کردن). پیرۆت ووتی: پارەی جزیەمان نیە و توانای شەڕیشمان نیە. موسڵمان دەبین. خالید ووتی: کەواتە دەبێت لە ڕیزەکانی ئێمەدابن لەپێشەوە و لە دژی فروخ بجەنگن.
پاشان، هورمز ووتی: گەورەم، من نەمتوانی ئەو تاوانە پەسەند بکەم و دژی نەتەوەکەی خۆم شەڕ بکەم. بۆیە ئێستا هاتووم بۆلات.
فروخ پاشا لەبەر خۆیەوە ووتی: بەخوا دیارە گڵۆڵەم کەوتۆتە لێژی، بۆیە ئەمانە لە پشتەوە خەنجەرم لێدەدەن! تەواو بێتاقەت بوو. فەرمانیدا و ووتی: هەر ئەم شەو بەیەکەیەکی سەربازییەوە دەچمە سەر پیرۆت و بۆ حەوت پشتی تەمبێی دەکەم.
شەو داهات. فرخ پاشا، بەیەکە سەربازییەکەیەوە هێرشی کردە سەرپیرۆت و کەسوکارەکەی لە ئاوایی مەرگە. پیرۆت، توانی هەڵ بێت و بچێتە لای سوپاکەی خالید. ئیتر لە ناو ئاوایی مەرگە شەڕ ڕوویدا لە نێوان فرخ پاشا و کەسوکارەکەی پیرۆت و هێزێکی سەربازی کە پێک هاتبوو لە ١٠٠٠ سەرباز بە سەرکردایەتیی مقداد کوری ئەسوەد، کە هاتبووە ناو دێکەوە، بەنیازی تاڵان کردنی ئەو دەوروبەرە، تا بەرەبەیان شەڕبوو. هەر کە ڕۆژبۆوە لەشکرەکەی فروخ پاشا کشایەوە بۆ ناو قەڵا. بەیانی مقداد سەیری کرد پێج کەس کوژراوە لە بەرەی کورد و دە کەسیش کوژرابوو لە خەڵکی ئاواییەکە، بەڵام لە سوپای عەرەبی موسڵمان ژمارەیەکی زۆر کوژرابوو و تەنها دوو کەس بەبرینداری زیندوو مابوونەوە. ئەوانیش بەناوەکانی(حارس، عبادە، کە

لە تایەفەی تەها بوون .(
فروخ پاشا، کاتێ گەڕایەوە ناو قەڵاکەی، ڕاوێژکاری سەربازی ئاگاداری کردەوە و وتی: تواناى سەربازیمان بەرەو لاوازی دەچێت و ناتوانین بەرەنگاری ئەو سوپا لەبن نەهاتووەی عەرەب ببینەوە. باشتر وایە، کە پاشەکشە بکەین و پرۆین بۆ دوگۆمان، بۆلای مامت، مالکی ئەژدەر. لەوێ هێزەکانمان یەک خەین و هێرش بکەینەوە سەر سوپای عەرەبی موسڵمان. بەڵام فروخ پاشا ڕازی نەبوو. هەستا بە نوسینی نامەیەک بۆ ئەزمەڕەی خوشکی و فەرمانی پێکرد، هەرچی هەیە و لە گەنجینەکاندایە، کۆی بکاتەوە و پروات بۆلای مامی لە دوگۆمان و مامی ئاگادار بکاتەوە لە مەترسیەکان.
ئەزمەڕەش، (لەوە دەچێت شاخی ئەزمەڕ بەناوی ئەم ژنەوە ناو نرابێت) هەرچی هەبوو لە گەنجینەکەدا کۆی کردەوە و ڕۆیشت بۆلای مامی و لە مەترسی ڕوداوەکان ئاگاداری کردەوە.
مالکی ئەژدەر، نامەی نووسی بۆ هەموو میرە کوردەکان و داوای کۆمەکی بەپەلەی لێکردن بۆهاوکاری فروخ پاشا..
چاوەڕوانی بەشی دوانزەیەم بن

ئەنفالی کوردان لەژێر سێبەری شمشێردا.

بەشی دوانزەهەم

ئیمام واقیدی ئەم مێژووە بەم شێوەیەی خوارەوە دەگێڕێتەوە:
خالیدی کوری وەلید سەرلەشکرەکانی کۆکردەوە و ووتی: ئەوە ماوەیەکە ئێمە لە گەڵ ئەم کوردانە شەڕ دەکەین. من هەرگیز نەتەوەی وەک ئەمانە بەهێزو ئازام نەبینیوە. من زۆرم شەڕ کردوە لەگەڵ سوپای رۆم و فارسدا، کە خاوەنی سەربازێکی زۆر بوون، بەڵام نەیان توانیوە لە مەیدانی جەنگدا لە نیوە ڕۆژێک زیاتر خۆیان ڕابگرن، بەڵام کوردەکان بەسوپایەکی کەمەوە لە مەیدانی شەڕدا بەڕاستی شەڕ دەکەن. بەرگری دەکەن و سڵ ناکەنەوە. ئێمە دەبینین جەنگاوەرەکانیان بەرەو ڕووی ڕمەکانمان دەبنەوە و سوور دەزانن دەکوژرێن، بەڵام هەڵنایەن و پشتمان تێناکەن. من زۆر دەترسم بەدەستی کورد توشی زەرەر و زیان ببین.
سەرلەشکرەکان بۆچونیان وابوو، کە داوای یارمەتی بکەن لە ئەمیر (اباعبید) تا سەربازی زیاتریان بۆ بنێرێت، بەڵام خالید ڕازی نەبوو و وتی من بەپاڵپشتی الله ئەجەنگم ئەگەر پێویستم بە یارمەتی بو قعقاعی کوری عمر بەهێزێکی زۆرەوە لە شارەزوورە و نزیکە، داوا لەو دەکەم بۆ یارمەتی (وەک دوایی لە چیرۆکەکەدا دەر دەکەوێت یارمەتیەکی زۆری بۆ هاتووە). خالید درێژەی بەقسەکانیدا و ووتی: نامەوێ لەم شەڕەدا شکست بێنم. شکست هێنانمان واتا چاوکردنەوەی هەموو میرە کوردەکان. دڵنیابن هێندە داخ لە دڵن بەرامبەرمان نایەڵن یەک سەربازمان بە بێ وەی رزگاری بێت. بۆیە دواتان لێدەکەم بە هەموو هێزێکتان لێیان بدەن و بە هیچ جۆرێك بەزەیی مەنوێنن. هەموویان لە خوێندا بگەوزێنن. دەمەوێت سەر نەبینم بەلاشەوە. دەبێت ئەم شەڕە یەکلایی بکەینەوە. نابێت لەمەزیاتر درێژە بکێشێ. هەرچی ئاوایی ئەم دەوروبەرەیە تاڵانمان کردووە. هیچیان تیا نەماوە. ئەگەر وا بڕوات ناتوانین خواردن و ئالیک دابین کەین بۆخۆمان و ئەسپەکانمان. من بیستومە فروخ پاشا نامەی ناردووە بۆ مامی. ئەگەر بێتو یارمەتی مامی پێبگات، ئەوا سەرکەوتنمان ئەستەم ئەبێت. بۆیە پێتان دەڵێم، دەبێ بەزووترین کات هێرشێکی بەربڵاو بکەینە سەریان. سەریان بۆمن و ماڵ و ژن ومنداڵیان بۆ ئێوە.

مقداد ئەسوەد لە سوچێکی خێمەکەدا دانیشتبوو. کابرایەکی شەڕەنگێز بوو. هەمیشە یەکەم کەس بوو بۆشەڕکردن. تینویی خوێن ڕشتن بوو. هاواری لێ بەرزبۆوە و ئەم ئایەتەی دا بە گوێی دانیشتوانا{إِنَّ اللّهَ اشْتَرَى مِنَ الْمُؤْمِنِينَ أَنفُسَهُمْ وَأَمْوَالَهُم بِأَنَّ لَهُمُ الجَنَّةَ يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللّهِ فَيَقْتُلُونَ وَيُقْتَلُونَ وَعْدًا عَلَيْهِ حَقًّا فِي التَّوْرَاةِ وَالإِنجِيلِ وَالْقُرْآنِ وَمَنْ أَوْفَى بِعَهْدِهِ مِنَ اللّهِ فَاسْتَبْشِرُواْ بِبَيْعِكُمُ الَّذِي بَايَعْتُم بِهِ وَذَلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ} سورة التوبة: ١١١واتە بەڕاستی اللە گیان ومالّی پرواداڕانی کڕیوە کە بەهەشتیان بداتێ لەبەر ئەوەی لە ڕێگای اللە جەنگ دەکەن، جا دەکوژن و دەکوژرێن، ئەمە بەڵێنی هەقە لەسەر ئەو کە لەتەورات وئینجیل وقورئاندا باسی کردووە، وەچ کەسێ لە اللە و بەڵێنی خۆی وەفادارترە، مزگێنیان بێ بۆ ئەو کڕین و فرۆشتنەی لەگەڵ اللە کردوتانە و هەرئەمەشە دەسکەوتی گەورەیە. خالید ووتی خۆتان ئامادەبکەن بەزووترین کات دەکەوینە ڕێ.
بەرەبەیان بوو. تاریکو ڕوون. شاخەکان هێشتا لە ژێر سێبەری شەودا بوون. لێرەو لەوێ گوێت لە دەنگی مەلێک دەبوو، کە لەسەر لقی دار بەڕووەکاندا خۆیان شاردبۆوە. کزەبای بەیانی، کە لە ڕێی دوورەوە دەهات و دەشت و دەری تەی دەکرد، هەواڵی سامناکی شەوی بەگوێی بەیاندا دەدا .خورەی ئاوی چەمەکان، کە لەگەڵ هەموو شەپۆلێکیاندا زیاتر لە سەرچاوەکەیان دوور دەکەوتنەوە، شەپۆلیان دەدا و دەڕۆشیتن بۆ ژیان. بۆ ئاوەدانی. ئای ئەمانە چەند جوان بوون. لەگەڵ دەنگی تەمبورەکەی دەستی پیری زەردەشتی، کە هەموو بەیەکەوە وێردەکانی بیری چاک و وتەی چاک و کرداری چاکی ئاوێستایان دەوتەوە، جوانی و شادی و خۆشەویستی پاک و ئاشتی و ئاوەدانی خوای کورد بوون. ڕەنگاورەنگی جل و بەرگەکان لە سروشتەوە سەرچاوەی گرتبوو. ئەمە سروشتمان بوو. ئەمە کولتورمان بوو. تەواو لەناو یەکدا تواببووینەوە. وورده ورده لە دەم کەلی شاخەکەوە خۆری بەرەبەیان سەری دەردەهێنا بۆ تێکشکاندنی تاریکی و دەرکەوتنی ڕۆژێکی نوێ. بەڵام ئەو ڕۆژە، مرۆڤە بەد ڕەفتارەکان، وەک پیشەی هەمیشەییان بە پێچەوانەی سروشتی ناوچەکەوە هەڵسوکەوتیان دەکرد. کە نامۆبوون بە هەموو جوانیەکانی. ئامانجیان شێواندنی ئەو جوانیە بوو، لەناوبردنی ئەو ئاوەدانیە بوو. بیرکردنەوەیان لە تاریکیەوە سەرچاوەی گرتبوو. ڕەشکردنەوەی ڕەنگەکانیان پێ بوو، بڕینی دەست و کوشتنی هەڵوێست و زیندەبەچاڵکردنی خانمانیان پێ بوو. بەئاگری دۆزەخەوە هاتبوون. ڕق و تۆڵەی اللە عەرەبەکەیان پێبوو.
لەناکاو دەنگێکی نامۆ بە گوێی کوردەواریدا هاواری کرد. قاتلوهم. هەرچی جوانی بو شێواندی. شەڕ دەستی پێکرد. خالیدی کوری وەلید، بۆ ئەوشەڕە مێزەرێکی سوری لەسەر نابوو. ئەمە ئاماژەی دەکرد بە دوو نیشانە: یەکەمیان، ڕەنگی سور نیشانەی هۆزەکەی بوو. دوەمیان، نیشانە بوو بۆ شەڕێکی خوێناوی.
ڕوو بە ڕووی سوپای کورد وەستان. هەردوو لا دەستیان کرد بە هێرش بردن. پیرۆتی کوری بەهرام، لە ڕیزی سوپای عەرەبی موسڵمان شەڕی دەکرد دژی کەسوکارەکەی خۆی. هەروەها فزلی کوڕی عباس و زبیری عەوام و باقی سەرلەشکرەکانی تر، لە مەیدانی جەنگەکەدا جێگەی خۆیان گرت. هێرشکردن لە هەردولاوە دەستی پێ کرد. شەڕی مان و نەمان بوو. دەنگی شمشێر، لەیەکدان و حیلە و دەنگی پێی ئەسپەکان و خرەخڕی زرێ پۆشەکان و هاوار و ناڵەی بریندارەکان، ئەمانە هەموویان تێکەڵ ببوون. پێی دەوترا جیهاد بۆ اللە. مەرگیان دەباراند، مەیدانی جەنگ داپۆشرابوو بە لاشەی کوژراوەکان. سوارەکان نەیان دەتوانی ڕێ بکەن. خالید سەیری کرد و لەبەرخۆیەوە ووتی: ئەمانە چین؟ بۆ ئەوەندە کەللە ڕەقن؟ لەمردن سڵ ناکەنەوە؟ ئەگەر ئەم کوردانە سەربازی من بوونایە هەموو جیهانم پێ داگیر دەکردن.
لەهەموو لایەك شەڕو پێکدادان بوو. هێرشە یەک لەسەر یەکەکانی خالید، کوردەکانی ناچار کرد پاشەکشە بکەن و برۆنەوە ناوقەڵاکە. تیرهاوێژەکانی سەر قەڵاکە کاریان پارێزگاری ئەوسوپایە بوو کەلە شەڕەکە پاشەکشەیان ئەکرد تاڕێگە لە سوپای دوژمن بگرن نە گەنە

شورای قەڵاکە. ئەو ئێوارەیە هەردوولا پاشەکشەیان کرد.
فروخ پاشا بەپەلە هەموو بەرپرسەکانی کۆکردەوە و وتی: هەر کە تاریک داهات دەبێت قەڵا لە ژن و منداڵ چۆڵ بکرێت. چونکە گەر دەستگیر بکرێن ئەوا دەبنە کەنیز و کۆیلە، ئێمە بە هیچ جۆرێک توانای ڕوبەروبونەوەمان نەماوە. بەرگریکردنیش لە پشتی دیواری قەڵاکەوە هیچ سودێکی نیە. باشتر وایە ئەوان لەپێشدا بڕۆن. هەرچی خواردن و کەلوپەلێک، کە هەیانە ببەن لە گەڵ خۆیاندا. ئەوانیش هەروایان کرد. بەڕێیان کردن.
فروخ پاشا، زۆر بە بێزاریەوە لە دارو بەردی قەڵاکەی دەڕوانی.چاوەکانی هەزارەها پرسیاری بێ وەڵامی تیابوو، لە دینیان لە کلتور و لە دەنگیان، لە کرداریان، هەروەکو بیەوێت شتێک بدا بەگوێی نەوەی دوارۆژدا هاواری کرد: ئەوەی من بینیم لێیان لە مەیدانی جەنگا لەم چەند ڕۆژە دڕندە بون مرۆڤ نەبون، درۆزن بوون، دز بوون ڕێگربوون، داوێنپیس بوون، پاسەوانی اللە خوێن ڕێژەکە یان بوون ... سەرێکی بەرز کردوە. تێربە باڵای کێوەکاندا ڕوانی. چاوی پڕیە ئەو لوتکەیەی، کە ئاگرەکەی زەردەشتی لێ پیرۆز دەکرا و وتی ئای ئاگرەکە لەناخما بڵێسە دەسێنی، ئاهورە مەزدا دەی ویست بەڕوناکی تۆ هەرچی تاریکی دنیایە لەبن بێنێت بەڵام ئێستا ڕوناکی پیرۆز خەریکە خۆت تاریک دەکەن. بەدڵێکی پڕ لە ئازارەوە، بەقورگێکی پڕ لە گریانەوە، پڕ بەباڵای کێوەکان هاواری کرد دەک پیرۆز نەبێت ... دەک پیرۆز نەبێت لێتان نەوەی کورد، ئاینی نە زانی ودۆزەخ پەرستی ....یەکێک لە ڕاوێژکارەکانی هات بۆلای پێی ڕاگەیان کاتی ئەوە هاتوە بڕۆین بۆلای مامت هەمووشتێک ئامادەیە فروخ پاشا بەناچاری ملی ڕێگەی گرتە بەر.
یەکێک لەدانیشتوانی قەڵاکە، کە ئامۆزای فستوربو (فستورئەوپیاوەی، کە فروخ پاشا ناردبوی بۆلای خالید دوایی وتیان فروخ کوشتویەتی) هەستا و بەدزیەوە چوو بۆلای خالید و هەواڵی هەڵهاتنی فروخ پاشای پێ ڕاگەیاند.
خالید ووتی چۆن بروات پێ بکەم! وتی من ئامۆزای فستورم دەمەوێت تۆڵەی لێ بکەمەوە.
خالید هەستایە سەر پێ و کەوتە اللە اکبر. ووتی: ئەوەی لێی دەترسام بوو بە ڕابردوو.
داوای لە مقداد ئەسوەد و عبداڵلەی عمری ختاب و زراری ئەزور و عبداڵلەی ئەیوب کرد، سوپا بەرن و بڕۆن.
پیرۆتی کوری بەهرام، وەک ڕێگە نیشاندەر و شەڕکەرێکی باش پێشیان کەوت. پێ ووتن: من دەزانم بۆ کوێ دەچێت! لەڕۆژئاوای قەڵای گەورەوە دەربەنێک هەیە کە لە بەینی ئەو دوو شاخەدایە. من دڵنیام لەوێوە دەڕوات بۆ لای مامی. دەبێت خێراکەین تا دەرباز نەبووە لە دەستمان.
سوپاکەی مقداد و عبداڵلە، خێرا پێش فروخ پاشا چوونە دەربەندەکە و لەم بەرو ئەو بەری دەربەندەکە بۆسەیان دانا. خۆیان مات کرد تا دەنگی پێی ئەسپەکانی فروخ پاشایان گوێ لێ بوو. دەنگیان نەکرد هەتا تەواو کەوتنە بۆسەکەیانەوە. ئینجا هەڵمەتیان بۆ بردن.
ئەو شەوە هەتا بەیانی شەڕ بوو. پیرۆتی کوری بەهرام، وەک کەوڵ سوری بەر لەشکر هێرشی دەبرد و ملی دەپەڕاند. کاتێ بە خۆی زانی گەمارۆ درابوو. بەچەند جەنگاوەرێ شمشێرێکیان لێدا و لە ئەسپەکە کەوتە خوارەوە. ڕمێکیان لەسەر سنگ چەقاند و کوشتیان.
لە گەورەقەڵاوە هەتا ئەزمەرە شەڕ بوو. تەپ و تۆزی پێی ئەسپەکان دەچوو بەئاسماندا. ئەم شەرە دادە نرێ بە یەکێک لە شەڕە گەورەکان، کە لەماوەیەکی کەمدا کوژراوێکی زۆر هەبوو. سوپای ئیسلام هەوڵیدا سوپاکەی فروخ پاشا بکات بە دوو بەشەوە، سەرکوتوو بوون لە هەوڵەکەیان. بەم جۆرە توانیان زاڵ بن و بەشێک لە سوپاکەی فروخ پاشا دوور بخەنەوە.
مقدادی ئەسوەد هێرشی کردە سەر فروخ پاشا دوای شەڕێکی دەستەو یەخە، بەیارمەتی هاوەڵەکانی توانی رمێک بکات بە سنگی فروخ پاشادا. فروخ پاشا کەوت. هەتا گیانی سپارد و تا چاوی لێکنا، بەباڵای کێوەکاندا دەیروانی و دەیووت: پیرۆز نەبێت لێتان نەوەی کورد، ئاینی نە زانی و دۆزەخ پەرستی. پیرۆز نەبێت نەوەی کورد.

سەرچاوەکان
فتوح سواد العراق محمد واقدی وەرگێرانی عبدالعزیزواعظی
طبقات ابن سعد
کوردستان و ئایینی ئیسلام مەلا ڕەوف سەلیم حوێزی
گێرانەوەی بەشێکی ئەو مێژووە لە دەمی خەڵکی ناو چەکە

ئەنفالی کوردان لەژێر سێبەری شمشێردا.

بەشی سیازدەهەم

وونبوونی گەنجینەکەی فروخ پاشا و بەدیلگرتنی هەزاران کچ و ژنی کورد و کردنیان بەکەنیزەك

کاتێك فروخ پاشا لە شەڕەکەدا گیانی لەدەستدا، موسڵمانە عەرەبەکان سەریان پڕی و کردیان بەسەر نوکی ڕمێکەوە. تا ورەی سوپای کوردی پێ پروخێنن. کەوتنە ووتنەوەی بەکۆمەڵی الله اکبر.

کوردەکان، کەبەم جۆرە سەری فروخ پاشایان بینی، ورەیان بەردا. سوپا زۆرەکەی عەرەب، توانیان سوپای کورد لەیەک دابپرن و بیانکەن بە چەند بەشێکەوە. لەمانە، هەندێکیان هەڵهاتن بەرەو شاخی کورکور و هەندێکی تریان هەڵهاتن و ڕویان کردە گردەکان ڕوەو ئەزمەڕ، کە ئەکەوێتە نزیک بناری بردەشان. بەشێکی تریان ڕوویان کردە دۆڵە قوڵەکان و لەوێ شوێنی نهێنیان هە بوو بۆ خۆ حەشاردان. کۆمەڵێکی تریان ڕویان کردە کولان تاگەشتنە کانی بێ دڵان و لەوێوە ڕویان کردە ئەشکەوتێ کە ئێستا ناسراوەبە ئەشکەوتی(کویخا شوانە) کەوتۆتە ئەودیو قەڵای کولارە. هەتا نەچیتە نزیکی نای بینی.

ئەوانەی لەشەڕەکەشدا گیران دوایان لێکردن موسڵمان بن. ئەوانیش ڕازی نەبوون کە دینی باو باپیریان بگۆڕنەوە بۆ دینێک کە لێی تێناگەن. بۆیە هەرلەوێدا هەموویانیان سەر پڕی.

عبداڵڵەی کوری عمری خەتاب، دوای ئەوانە کەوت کە ڕویان لە دەشتەکان کردبوو. پاش ئەوەی لەپەلامارەکەیدا، زۆبەیانی کوشت، ڕێی کەوتە دەشتێکی پان و بەرین و چۆڵ. توشی سەرچاوەی ئاوێک بوو کەلەبەینی دووگردا دەهاتەخوارێ. لەوێ چەند ئەشکەوتێکی لێبوو. خەڵکی گوندەکان، خۆیان و ماڵ و مناڵیان تیا حەشاردابوو. عبداڵڵەی کوری عمر، توانی بیان دۆزێتەوە و هەموویان بکوژێت و ژن مناڵەکانیان و ١٥٠٠ سەرمەڕ بەغەنیمە بەرێت.

عبدڵڵە کوری عمر، هەرچی لادێی ناوچەکە بوو، بەشەڕ، هەموویانی تاڵانکرد و ئەوەی موسڵمان نەبوایە دەبوایە، دەبوو جزیە بدات، ئەگەر نا، دەکەوتە بەر ڕەحمەتی شمشێرەکەی.

ژن و کوروکچی تازە پێگەشتوو، هەمووان، دیل کران و وەک دەستکەوتی شەڕ، کران بە کەنیزو غوڵام و لە گەڵ خۆیدا بردنی و گەڕایەوە بۆلای خالید.

هەروەها، مقدادی ئەسوەد، دوای ئەو کوردانە کەوت کە ڕوەو شاخەکان هەڵهاتن. تا پشتی مەرگە، بەدوایانەوەبوون. تا گەشتنە جێگایەک دارستان و ئاوێکی زۆری لێبوو. پڕبوو لە باخی میوە. دەڵێن ئەوجێگەیە وەک بە هەشت وابووە! سەربازە عەرەبەکان ووتویانە ئەمە ئەو بەهەشتەیە کە باس دەکرێت. لە وێ، شەڕ ڕوویدا، لە بەینی ئەوان و سەربازە هەڵهاتوەکانی فروخ پاشا. جەنگاوەرە کوردەکان، توا نیان ٥٠٠عەرەبی موسڵمان بکوژن. لەوانە، عمری حاتم

تایی و عبدول قاهر وسالم عمری تەمیمی و سعدی ساعدی قریشی و جندەلی کوری عبداڵڵە علی مکی.

پاڵەوانێکی کورد، بەناوی باربەک، کە تیرهاوێژێکی بێ وێنە بوو. توانیی بە تیرێک عمرو کوری عدەیە بکوژێت. مقداد، چاوی لێبوو. دوای باربەک کەوت. ئەم بە سواری و باربەک، پیادە بوو و بە ڕاکردن سەرکەوت بەسەرشاخەکەدا. لە وێ باربەک خۆی خستە پشتی بەردێکی گەورەوە و مقداد، لەئەسپەکەی دابەزی و دوای کەوت. بەدەوری گادەردەکەدا دەسورانەوە. نەی توانی باربەک بگرێت. بەهیلاک چوو. بۆیە مقداد، سوێندی شمشێرەکەی دا و ووتی: بە اڵلە سوێندت دەدەم لەو بەردەت ئەدەم دە بێت بەردەکە لەت بکەیت ئەگەر نەی کەیت، ئەوا لەلای اڵلە سکاڵات لێدەکەم، ئەوە بوو شمشێرەکەی لە گابەرد دا، لە گەڵ باربەک لەت بون بەیەکەوە! باربەک، بەو جۆرە کوژرا.

مقداد، گەڕایەوە و لە گەڵ سوپاکەیدا، ڕوویکردە دۆڵە قوڵەکان. سەیری کرد لەوێ شوێنی حەشارگەی پیر و مناڵە. کەلەترسی سوپای عەرەب، خۆیان شاردبۆوە. مقداد، هەموویانی دیل کرد. منداڵە تازە پێگشتوەکانی کرد بەغەنیمەی شەڕ و سەبارەت بەپیرەکانیش، مقداد، داوای لێکردن موسڵمان بن. ئەوانەی ڕازی نەبوون فەرمانی کردلە سەریان بەن. ئەم دۆڵە بە دۆڵی سەرئاو بە ناوبانگ بوو. ئێستا، پێی دەڵێن دۆڵی کورکور. ئەم ناوچانە هە مووی سەر بە شانشینەکەی فروخ پاشا بوو. هەر لە کۆسرەتەوە تا شینکایەتی لە پشتدەرەوە تا شارەزوور لەژێر قەڵە ڕەوی ئەودا بوون.

دوایی مقداد، ڕوی کردە شاخی کورکور. لەوێ باخێکی گەورەی لێ بوو. پیاوێکی پیر باخەوانی دەکرد. سەر ئەو شاخەکە جێگەیەکی زۆر دڵ گیر بوو. مقداد، چووەلای و ووتی: ناوت چیە؟

کابرای پیرەمێرد، وەڵامی دایەوە و ووتی: ناوم کورکورە.

پاشان میقداد، لێی پرسی: ئیش بۆ کێ دەکەی؟

کورکوری پیرەمێرد، وەڵامی دایەوە و ووتی: من، زۆردەمێکە باخەوانی فروخ شام.

مقداد، بە پێکەنینێکەوە ووتی: من فروخ پاشام کوشت. سەربازەکانیشیان هەر بە دەستی ئێمە کوژران.

کورکوری پیر، ووتی: ئەگەر توانای شەڕم دەما، ئەوا، لەتۆڵەی فورخ پاشادا، ئێستاهەمووتانم بە بەرد دەکوشت.

مقداد، پێی ووت: ئەی پیرە مێرد، موسڵمانبە. کەس نەماوە تا پارێزگاریت لێبکات.

کوردەی پیرەپیاو، هەناسەیەکی ساردی هەڵکێشا و بەو پەڕی جورئەتەوە، وەڵامی دایەوە و ووتی: سوێند بە ئاگری پیرۆز، بە ئاهورامەزدا، وازلە دینی باو باپیرانم ناهێنم. نایگۆڕمەوە بۆدینی مرۆڤ کوشتن. خاک و ووڵاتم نادەم بە دەستەوە.

مقداد، تەواو توڕە بوو و ووتی: ئێمە، ئەم ووڵاتە داگیر دەکەین و بەزۆر، دینەکەتان پێ دەگۆڕین. واش لە نەوەکانتان دەکەین، تف و نەعلەت بۆ هەزار پشتی خۆیان بنێرن. پاشان، مقداد، شمشێرێکی دا لە ملی و سەری پەڕاند. لەوکاتەوە، خەڵکی ناوچەکە لە خۆشەویستی ئەو پیاوە، ئەوشاخەیان بەناوی ئەوهوە ناوناوە کورکور.

مقداد، دەستی گرت بەسەر هەموو زەوی و زاری فروخ پاشادا و لە ژێر ناوی(سوافی) دەوڵەتی عەرەبی ئیسلام دەبووە خاوەنی و پارەکەی دەچوە گیرفانی عەرەبەکانی مەکە و مەدینەوە. خەڵکی ناوچەکەی لێ بێبەری دەکرا. مقداد، بە دەست کەوتێکی زۆرەوە گەڕایەوە بۆلای خالید کە ئێستا لە قەڵاکەی فروخ پاشا، نیشتە جێ بووە. زۆر دڵخۆش بوو بە دەست کەوتەکانی مقداد عبداڵلە و کەوتە دابەش کردنی دەستکەوتەکان. پێنج یەکیشی نارد بۆ مەدینە بۆ خەلیفە عمر.

خالید ،زۆر سۆراخی گەنجینەکەی فروخ شای کرد، کە بەر دەستی نەکەوتبوو. نەیدەزانی چی لێ هاتووە. نە لەگەڵ خۆی بردبوویو نە لە قەڵا جێی هێشتبوو. وەک دوایی دەرکەوت، پێش دەرچونی لەقەڵاکە گەنجینەکەی ڕەوانە کردووە بۆ شوێنێکی نهێنی و لە ژێر گڵدا شاردویەتەوە. دەڵێن، تا ئێستاش ئەو گەنجینەیە بێ سەرو شوێنە. خالیدی کوری وەلید کاتێ هەواڵی

خۆكۆكردنەوەی سوپاكەی مالكی ئەژدەری بیست سێ ڕۆژ و سێ شەو لە قەڵاكە مایەوە و نەهاتە خوارەوە.

ئەنفالی كوردان لەژێر سێبەری شمشێردا.

بەشی چواردەیەم

چەندین جار عومەری كوری خەتاب،ویستوویەتی ( محەمەد) پێغەمبەری موسوڵمانان بكوژێت

مالكی ئەژدەر، كاتێ هەواڵی كوژرانی، فروخ شای برازای بیست، زۆر هەوڵیدا فرمێسكی قەتیس ماوی چاوەكانی بگرێت و بیشارێتەوە. بەڵام، نەیتوانی فرمێسكەكانی بەناو ڕیشە سپیەكەیدا تنۆك تنۆك دەهاتە خوارەوە. هەناسەیەكی قوڵی هەڵكێشاو چەند جارێك لەبەرخۆیەوە ووتی: هەی داد هەی داد بۆدڵەی پڕ لە ئازارم.

سەری بەرز كردەوە و چاوەكانی پڕی بووە ئاسمان و نەیدەتروكاندن. حەوت هەنگاو چووە پێشەوە و ڕووەو زەردەپەڕ، دەستێكی بەرزكردوە و ووتی: ئەی ڕەوانی فروخ شا، تۆ لەدنیای نادیارەوە هاتی. هەرگیز هی ئەم دنیایە نەبووی. تۆ، خولقێنراوبووی هەرگیز هەمیشەیی نەبووی. تۆ، سەر بە ئاهورا مەزدا بووی، نەك ئەهریمەن. تۆ، چاكەكاربووی. دژی خراپە بووی. تۆ، وولاتپارێز بووی. شەڕ فرۆش نەبووی. تۆدژی لەشكرەكەی ئەهریمەن جەنگای تۆ مرۆڤ بووی، دڕندە نەبوی. فروخ شا، برازاكەم. بینایی چاوان، ڕەوانت بە دیداری ئاهورا شاد بێت. بەڵێن بێت، تۆڵەت لە دینی عەرەبی مرۆڤ كوژ دەستێنم.

خەریك بوو بەتەواوی خۆر ڕوناكیی نەدەما. بەڵام، شا ئەژدەر، هێشتا چاوی لەسەر دووا پرشنگی خۆر بوو، كە كز دەبوو. لە پشتی كێوەكانەوە ئاوا دەبوو. كاتێ ئاوری دایەوە، سەیری كرد وەزیرەكانی كەمێك دوورلەمر، بێدەنگ، لەبەر ڕوناكی ئەو مە شخەڵانەی كە بەدیواری كۆشكەكەیەوە هەڵواسرابوون، وەستابوون. جارجار كزەبای ئێوارە، وەك شەپۆلێ لە گڕەكانی دەدان و دەموچاوەكانی تاریك و ڕوون دەكرد. شا ئەژدەر ڕووەو ئەوان لەسەرخۆ هەنگاوی دەنا. بەخێرایی فرمێسكەكانی دەسڕی، تاكەس هەستی پێ نەكات. كاتێ گەیشتە نزیكیان، بانگی فیروزی كوری كرد و پێی ووت: دەبێت بەزووترین كات، سوپایەكی باش كۆبكەیتەوە، تا هێرش بكەیتە سەرئەو دڕندانە و تۆڵەی فروخ شا بكەیتەوە.

پاشان، ڕوویكردە وەزیرەكان و ووتی: دەبێت نامە بنووسن بۆ هەموو میرە كوردەكان و داوای كۆمەكیان لێ بكەین. دەبێت هەر ئێستا نامە بنووسرێت بۆ میری مەنگوران و هەروەها بۆ میری سویسنیان، كە ناوی سۆسەن شایە. هەوەها بۆ میری رەبەت كە ناوی هورمزبوو و كە خاكی گەورەكانە لەشاری قیروان بوو. هەروەها نامەیەكیش بنووسن بۆ شای پشتدەر.

بۆ ڕۆژی دووایی نامەكانیان نارد. .پاش ماوەیەك هەموویان سەربازیان نارد بۆ كۆمەك، تەنها شای پشتدەر وەڵامی نەدانەوە. دەڵێن، لەوكاتەدا دوژمنایەتی هەبوو لە نێوانیاندا.

شا ئەژدەر، سوپایەكی گەورەی كۆكردوەو كورەكەی كردە سەر لەشكرو داوای لێكرد، تۆلەی فروخ شا بكاتەوە لەعەرەبەكان.

خالیدی كوری وەلید، كەزانیی لە دوگۆمان، مالكی ئەژدەر، زۆر تورەیە بۆ مەرگی برازاكەی و لەشكر كۆدەكاتەوە، سێ ڕۆژ لە قەڵای گەورە نەهاتە خوارەوە. ترسا بوو كە ئەژدەر شا هێرشی كتوپڕ بكاتە سەری. بەڵام، ئەوە ڕووی نەدا. بۆیە، خالید، بەفرسەتی زانی و داوای یارمەیتی كرد كە سەربازی زیاتری بۆ ڕەوانە بكەن. هەروەها، هەرچی دەست كەوت بوو، لەتاڵانیی ناوچەكە، پێنج یەكی ڕەوانەكرد بۆخەلیفە عمر، لەگەل دەست بەسەراگرتنی زەوی و

زاری ئەو میرانەی لەشەڕەکاندا کوژرابوون، یان هەڵهاتبوون. هەموویان کران بە موڵکی دەوڵەتی عەرەبی ئیسلامی لەژێر ناوی (سەوافی). هەرچەندە ئەم زەوی وزارانە لە پێشدا کێشەیەکی گەورەی دروست کرد بۆ خەلیفە عمر. لەبەر ئەوەی سەربازەکان دەیان ووت ئەم زەویانە غەنیمەی شەڕە و بەزەبری شمشێر دەستمان بەسەردا گرتووە. لەسەر ڕۆشنایی ئایەتی ٤١ئەنفال واعلموا أنما غنمتم من شيء فأن لله خمسه ولرسول. دەبێت بەسەرماندا دابەش بکرێت و پێج یەکی بۆ دەوڵەت بێت. لەوانەی پشتگیری ئەم بۆچوونەیان دەکرد، بیلالی حەبەش و عبدالرحمانی کوری عوف و زبیری کوری عەوام بوون. بەڵام، خەلیفە عمر، ڕازی نەبوو و ووتی: ئەبێت بدرێتەوە دەست خەڵکی ناوچەکان. لە بەرامبەردا، باج و سەرانەیان لێ وەگرن. وەک داهاتێک بۆ دابین کردنی خەرجیی دەوڵەتی عەرەبیی موسڵمان.

کاتی ئەوە هاتووە بزانین عومەر کوری خەتاب، دووەم خەلیفەی موسڵمانان، کێیە؟ ئێمەی کورد، تەنها دیوێکی کەسایەتیی عومەر دەناسین. با بزانین دیوەکەی تری چۆنە؟

ناوی تەواوی، عمری کوری خطاب کوری نوفل کوری عبدالعزیزی کوری ڕیاحی کوری عبدوڵلا....کوری غالب (قورەشیی عدویە)، لەگەڵ محمد يەك دەگرنەوە لە کەعبی کوری لوئەی کوری غالبدا.

چەند نازناوێکی هەبووە و گرنگترینیان (أبا حفص،الفاروق) بوون. خەلیفە عومەر، بەمنداڵی، شوانی حوشتر بووە. باوکی، پیاوێکی زۆر توندو تیژ بووە. زۆربەی کاتەکان، لێیداوە و زۆرخراپ بووە لە گەڵیدا. بۆیە، ئەم توندو تیژییە، لە گەڵ عومەردا، گەورە بووە و لەمیشدا ڕەنگی داوەتەوە و بە هەمان شێوەی باوکی، توندو تیژبووە. لەگەڵ منداڵەکانیدا، باوکێکی باش نەبووە. جارێک، دەڕواتەوە بۆ ماڵەوە. سەیر دەکات کورەکەی قژ دادەهێنێ. لە دوواوە، هەتا هێزی تیا دەبێت، دارێکی پێدا دەکێشێت و پێی دەڵێت: دەبینم خۆت جوان دەکەی!

جارێکیتر، سەیر دەکات، کورێکی تری گۆشت دەخوات. لێدانێکی باشی لێدەدات و بەکورەکەی دەڵێت: ئەوە بۆ گۆشتت دەخواد؟

کورەکەی، دەڵێت: حەزم لێی بوو.

عومەر دەڵێت: دەکرێت هەرچی حەزت لێی بوو بیکەیت؟

عومەر، باسی زیندە بەچاڵکردنی کچەکەی خۆی دەکات و دەڵێت: من، کچەکەمم بردو کردمە چاڵێکەوە. من، خۆڵم دەکرد بەسەریا. کچەکەشم ئەوتەپوتۆزەی بەڕیشمەوەبوو، دەیتەکاند. بەو جۆرە، کچەکەمم زیندە بەچاڵ کرد.

عومەر، زۆر توندوتیژ بوو بەرامبەر ئەوانەی موسڵمان ببوون. دەڵێن، کەنیزەیەکی هەبوو، هەر کە پێی زانیبوو موسڵمان بووە، هەمووڕۆژێک لێی دەدا، هەتا دەیخستە حاڵی مردن. ئینجا وازی لێ دەهێنا.

زۆربەی موسڵمانەکان لێدانیان،بەدەستی عومەر خواردوە و دوژمنێکی سەرسەختی محەمەد بووە. چەند جارێك ویستویەتی محەمەد بکوژێت! وتویەتی: محەمەد، سەرچاوەی دووبەرەکییە و شکۆمەندیی قورەیشی خستۆتە مەترسیەوە. بۆیە دەبێت بکوژرێت.

دەڵێن، کەس وەک عومەر، ئاوا بە ئاشکرا، باسی کوشتنی محەمەدی نە کردووە و وتوویەتی: من دەچم دەیکوژم و بادوواییی بەنی هاشم، من بکوژنەوە. هەمیشە، بەدووای محەمەدەوەبووە. ژیانی لێ تاڵکردووە.

چەند سەرچاوەیەک دەڵێن: عومەر، لەگەڵ هاورەگەزی خۆی جووت بووە.

هەندێک سەرچاوەی تر دەڵێن: بەوجۆرە نەبووە. بەڵام، عومەر، نەخۆشییەک لە کۆمیدا بووە. چارەسەری نەخۆشییەکەی تەنها بەتۆوی پیاو بووە. بۆیە، ئەوکارانەی کردوە!!!

باس لەوە دەکەن، عومەری خەتاب، خەلیفەی موسڵمانان، هەمیشە شەرابی خواردۆتەوە و نەی توانیوە دەست بەرداری بێت و وتوویەتی: بۆیە شەراب دەخۆمەوە، چونکە من، کە گۆشتی حوشتر دەخۆم گەدەم ئازاری پێدەگات. شەرابەکە، باش گۆشتەکە هەرس دەکات. کەچی بەپێی سەرچاوە باوەڕپێکراوەکان، دەرکەوتووە، عومەر، زۆر کەم گۆشتی حوشتری خواردووە.

لە شوێنێکی تردا وتوویەتی: من هەمیشە (قەبزم)، بۆیە شەراب دەخۆمەوە، بۆئەوەی ڕەوان بم! الشعبی، دەڵێ: جارێک عەرەبێکی سەحرانشین، لە شەرابەکەی عومەری خواردەوە. یەکسەر بورایەوە. دەڵێن، شەرابەکە کحولی زۆر بووە. بۆیە عومەر، یەکسەر دەکەوێتە لێدانی کابرا لە بەر ئەوەی سەرخۆش بووە.

هەروەها عومەر، ڕێگای داوە بەخەڵکی شام، کە شەراب بخۆنەوە. لەبەر ئەوەی ووتوویانە نەخۆشین و نەخۆشییەکەمان، بە شەراب چاک دەبێتەوە.

باسی خەلیفە عومەر، بەم بەشە تەواو نابێت و هەوڵ دەدەم، لە بەشی داهاتوودا تەواوی ژیان و کارو کردەوەی بخەمە ڕوو.

ئەمەش سەرچاوەکان بۆ ئەوەی قسەتان بیرم برایانی داعشی موسوڵمان هههه:

الأنوار النعمانية ٦٣/١.

الطبقات الكبرى، تأليف: ابن سعد، .

٦ ↑.أ ب محض الصواب في فضائل أمير المؤمنين عمر بن الخطاب.

٧ ^.سيرة ابن هشام

٨ ^.أسد الغابة في معرفة الصحابة لابن الأثير

٩ ^.تاريخ الخلفاء، تأليف: السيوطي

**کورتەیەك لەڕاستییە شاراوەکانی ژیانی عومەری کوڕی خەتاب، کوردستان وئایینی**

ئەنفالی کوردان لەژێر سێبەری شمشێردا.

**بەشی پانزەهەم**

**لە بەشی پێشودا، باسم لە ژیانی خەلیفەی دووەمی موسوڵمانان، عومەری کوڕی خەتابم کرد و لە بەر درێژیی بابەتەکە، نەمتوانی لە بەشێک دا جێگەی بکەمەوە. بۆیە هەوڵ دەدەم ئەوەی کەماوە لە م بەشەدا بینووسم. من بە گرنگی دەزانم ئەو کەسایەتیانەی کەڕۆڵیان هەبووە لە داگیرکردنی کوردستاندا، بە خوێنەری کوردیان بناسێنم. تا بزانن ئەو خەلیفەیە و ئەو هاوەڵانە ی محەمەدی پێغەمبەری موسوڵمانان، کێن کەوا لە ئێمەی کورد کراون بە فریشتە.**

**عومەری کوڕی خەتاب یانزە(١١) ژنی هێناوە و سێ ژنیانی تەڵاق داوە لە بەر ئەوەی موسڵمان نەبوون. تەنانەت منداڵیشی لێیان هەبووە. کۆی گشتیی**

منداڵەکانی عومەری کوڕی خەتاب، ١٥ مناڵ بووە(٣کوڕی ناویان عبدالرحمان بووە٢کوڕی تری ناویان عبداڵله بوە ٢کوڕی تری ناویان زەید بووە بۆیە ئەم ناوانە سێ بارەو دوو بارە کردۆتەوە جارێ محمد پێی ووتوە اڵله حەزی لەم ناوانیە ؟.

عومەری کوڕی خەتاب، مرۆڤێکی زۆر دڵ پیس بووە محمد وەسفی کردوە بە (شدید غیره) هەتا دڵی لە ژنەکانی محمد پیس کردبو کاتێ کە سەحابەکان هاتو چۆی ماڵی محمدیان دەکرد دەکەوتنە قسەکردن لە گەڵ ژنەکانی محمد، بۆیە عمر دڵی محمدی پیس کرد لەژنەکانی پێی ووت چاکوخراپ ڕووت تێ دەکەن بۆ بە اڵله ناڵی ئایەتێک لەوبارەیەوە دابەزێنێت تۆزێک ژنەکانت بگرێتەوە حجاب بکەن(حجاب سەر داپۆشین نەبوە بەڵکوو سنگ داپۆشین بوە) ئەوەبو اڵله بە قسەی عمری کرد! ئەم ئایەتەی دابەزاند( يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَدْخُلُوا بُيُوتَ النَّبِيِّ إِلَّا أَنْ يُؤْذَنَ لَكُمْ إِلَىٰ طَعَامٍ غَيْرَ نَاظِرِينَ إِنَاهُ وَلَٰكِنْ إِذَا دُعِيتُمْ فَادْخُلُوا فَإِذَا طَعِمْتُمْ فَانْتَشِرُوا وَلَا مُسْتَأْنِسِينَ لِحَدِيثٍ ۚ إِنَّ ذَٰلِكُمْ كَانَ يُؤْذِي النَّبِيَّ فَيَسْتَحْيِي مِنْكُمْ ۖ وَاللَّهُ لَا يَسْتَحْيِي مِنَ الْحَقِّ ۚ وَإِذَا سَأَلْتُمُوهُنَّ مَتَاعًا فَاسْأَلُوهُنَّ مِنْ وَرَاءِ حِجَابٍ ۚ ذَٰلِكُمْ أَطْهَرُ لِقُلُوبِكُمْ وَقُلُوبِهِنَّ ۚ وَمَا كَانَ لَكُمْ أَنْ تُؤْذُوا رَسُولَ اللَّهِ وَلَا أَنْ تَنْكِحُوا أَزْوَاجَهُ مِنْ بَعْدِهِ أَبَدًا ۚ إِنَّ ذَٰلِكُمْ كَانَ عِنْدَ اللَّهِ عَظِيمًا ﴿٥٣﴾ کاتێک ئەو ئایەتە دابەزی دەبوایە ژنە ئازادەکان سنگیان دەپۆشیایە بۆ ئەوەی کەس دەستیان بۆ نەبات بە ڵام ئەم ئایەتە ئافرەتە کۆیلەکانی نە دەگرتەوە. جارێ عمرئافرەتێکی کۆیلەی هەبوو(کەنیزە)چوە بۆ ماڵەوە سەیری کرد سنگی داپۆشیوە بە دارەکەی دەستی لێیدا داوای لێکرد کە جارێکی تر خۆی دانە پۆشێ ،دواین ژنی کە هێنای(ام کلثوم) کچە بچوکەکەی علی کوڕی ئەبی تالب بووهەرچەندە عمر١٧ساڵ لەعەلی گەورەتر بوو بەڵام زۆر بێشەرمانە چووە داوای ئەو کچە منداڵە ی عەلی کە تەمەنی ١١ ساڵ بوو و عمرخۆشی تەمەنی ٥٧ساڵ بوو ، علی ووتی مناڵە تۆ گەورەی لە وەڵامدا عمر ووتی دەمەوێت منالێکم هە بێت لە نەوەی محمد ئەوە بو علی (ام کلثوم)نارد بۆلای بۆ ئەوەی یەکتر بناسن لەو چاو پێکەوتنەدا عمر خۆی پێ ناگیرێت دەست دەبات بۆرانی (ام کلثوم) ئەویش لە دەستی هەڵ دێت دەگەرێتەوە بۆلای باوکی بە باوکی دەڵێت ئەگەرخەلیفەی بڕواداران نەبوایە دەمم دەشکاند لەوەڵامدا علی دەڵێت کچم ئەوە دەبێت بە مێردی تۆ(ام کلثوم) دوای شوی پێدەکات کوڕو کچێکی لێی دەبێت. عمر چەند ئایەتێکی داواکردوە لە محمد اڵله ڕازی بوە لەسەرداواکەی بەقسەی عمری کردوە ئایەتەکانی دابەزاندوە جارێ عمر دەچی بۆ ماڵی محمد سەیر دە کات ژنەکانی محمد قسە بەمحمد دەڵێن هاوار دەکەن بەسەریا عمر بەژنەکان دەڵێت خۆتان چاك بکەن یان خوای گەورە ئافرەتانی باشتر لەئێوە دەبەخشێتە محمد ئیتر اڵله یەکسەر ئەم ئایەتە دادەبەزێنێ [عسى ربه ان طلقكن ان يبدله أواجا خيرا منكن]التحريم: ٥هەروە هاعمر بە محمد دەڵێ بۆ قیبلە ناگۆری لە قودسەوە بۆ مەکە لەمەشدا اڵله بێ یەکو دوو ئایەتی [واتخذوا من مقام ابراهيم مصلى]البقره١٢٥دەنێرێ

هەرچەندە ئەم بڕیارەی عمر بۆ دژایەتی کردنی جولەکەکان بوو بۆکەم کردنەوەی نرخی وبەهای قودس وبوو هەوڵدانێ کیش بووبۆ سەبەخۆکردنی ئاینێکی عە رەبی ئیسلام بە اڵلەیەکی عەرەبی قورئانێکی عەرەبی کەعبەیەکی عەرەبی.یەوە دیارە عمر بەوە ناسراوەکە ڕەگەز پەرست بوە زۆر هەوڵی داوە کە بەهیچ جۆرێک ڕێ نەدا کە بێجگە لە عەرەب هیچ نە تەوەیەکی تر لە مەکەو مەدینە بژین کاتێک دەسە ڵاتی گرتە دەست هەرچی جولەکە بو لە جەزیرەی عەرەبی وەدەرینا دەستی گرت بە سەر ماڵو موڵکیاندا.هەروەها لە گرتنی دیلەکانی شەڕی بەدردا عمر دواى کرد کە هەموو دیلەکان بکوژن ئەوەبو اڵلە دیسان بەقسەی کردو ئایەتی خۆی بۆنارد هەموویانیان کوشت؟.ئایەتێک هەیە اڵلە ئاگای لێ نەبوە لەلایە عمر خۆیەوە دابەزیوە و "الشیخ والشیخة إذا زنیا فارجموهما البتة نکالاً من اڵلە واڵلە عزیز حکیم". واتە پیاو ژنی زیناکار ڕەجم بکەن نەعلەتی اڵلە یان لێ بێت اڵلە خۆشەویست و زانایە.عمرتوانی بانگ دان بگۆڕێ محمد رسول اڵلەی بۆزیاد بکات. عمر ڕۆژێک ئاگای لێ بوو کە حەمزە مامی محمد سوکایەتی بە ابی جەهل خاڵی دەکردوجنێوی پێ دەدا عمر چوە ماڵەوە شمشێرەکە تیژ کردەوە ڕۆشتە دەرەوە چاوی کەوت بە نعیم بن عبد اڵلە بە عمری ووت بۆوا تورەی ئەقڵت لەدەست داوە دەتەوێت چی بکەی ووتی دەڕۆم محمد دەکوژم کە بۆتە هۆی فیتنەی نێوان قورەیشیەکان جنێو بە بتەکانمان دەدات خەریکە هەموو عەرەب دەکات بە دوژمنی یەکتر ئەویش پێی دەڵێت پێش ئەوەی محمد بکوژیت برۆ ماڵی فاتمەی خوشکت بزانە لەوێ چی دەگوزەرێت. عمر، بە پەلە دەچت بۆماڵی خوشکەکەی سەیر دەکات سەعیدی زاوای و فاتمەی خوشکی قورئان دەخوێنن لێدانێکی باشی سەعیدی زاوای دەکات و مستێ دەکێشێت بە دەمی فاتمەی خوشکیدا هەموو. دەمو چاوی دەکات بە خوێن.

عومەر، کاتێ شەڕی عێراقی دەکر،د داوای لە هەڵگەڕاوەکان کرد، (ئەوعەرەبانە ی وازیان لەئیسلام هێنابوو) بڕۆن بۆ شەڕەکە و یارمەتیی سوپاکەی مثنی کوڕی حارثە بدەن. من نازانم عمر عەربی بێ دینی دەنارد تا خەڵکی ئێراق بکەن بە موسڵمان یان بۆ هێنانەوەی تاڵانی.

عمر بە هیچ جۆرێک نەی ووستوە دینی ئیسلام بڵاو بکاتەوە ئامانجی ئەو تەنا بەدەست هێنانی تاڵانی بوە بۆ نمونە کاتێک کە قعقاع هێرش دەکاتە سەرحەلوان بەشەڕ داگیری دەکەن تاڵانی دەکەن قعقاع سەرکردایەتی سوپا دەدات بە سعد جریری کوری عبداڵلە ئەویش نامەیەک دەنووسێت بۆ عمر هەواڵی شاری حەلوان پێ ڕادەگەیەنێت عمر لەوەڵامی نامەکەیدا دەنوسێت حەزم دەکرد لەنێوان ڕەشە خاکی ئێراق و هەرێمە شاخاویەکان واتە (کوردستان) شورایەکی ئەستوربوایە یان شورایەکی ئاگرین بوایە نە ئەوان ڕێیان بوایە بهاتنایە بۆلای ئێمە نە ئێمە ڕێمان بوایە بچین بۆلای ئەوان بۆیە داوات لێ دەکەم لە جێگەی خۆت بوەستی لەوە زیاتر

دوایان نەکەوی ئەم ووتەیە عمری کوری خەتاب دوووااتای گرنگی هەیە کە دەی سەلمێنێت ١نەیویستوە لە ئێراق زیاتر بڕوات زەویە بە پیتەکانی ئێراقی بەس بوەتالانی ٢ هەستی کردوە کە کورد پارویەکی ئاسان نیە وکورد بەهەموو توانایەکیەوە بەرەنگاری لەشکری ئیسلام دەبێتەوە .بۆیە سعد جریری کوری عبداللە ڕێکەوتن لەگەڵ کوردەکانی ئەوشارە مۆر دەکات کە وازیان لێ بێنن بەمەرجێ سەرانە(جزیە) بدەن دیارە بەو بڕیارە رازی دەبن یەکێک لەخۆیان بە ناوی قوباد دەکرێت بە میری حەلوان .عمر هە تا (جزیە)ی سەرانەی لە سواڵکەرە غیرە عەرەبەکانیش دەسەند دەیدا بە سواڵکەرە عەرەبەکان ڕۆژێک پیاوێکی پیری جولەکەی بینی سواڵی دەکرد پێی ووت ئەوە بۆسواڵ دەکەی ووتی جولەکەم دەبێت سەرانە بدەم بە ئێوە موسڵمان. لەڕۆژی فتحی مەکەدا محمد ابو سفیانی بانگ کرد ووت ئێستا دەڵێی چی هەر بڕوا ناهێنی لەوەڵامدا ووتی من بڕوام بە خواهەر هەبوە محمد زۆر بەتورەیەوە ووتی واتا بڕوات بەمن نیە ئەبو سفیان قسەی نەکرد بۆیە عمر بردی تاماوەیەکی زۆرلە ماڵی خۆیان شاردیەوە تا تووڕەیەکەی محمد دامرکایەوە.عمری کوری خەتاب لەداگیرکردنی وولاتان دەسکەوتێکی یەجگار زۆری دەست کەوت تاوای لێهات جێگە نەمابو ئەو هەموو زێرو زیو تالانیەی لێ دانێن مزگەوتەکانیان لێ پڕ کردبوو عمر نەی دەزانی چۆن ئەو پارەی دزیە دابەش بکات بە دەفر یان بە چنگ عمر وەک ئەبو بکری نەکرد هاوەڵەکانی محمد دەبوایە بەشی شێریان هەبوایە ئەوەی لەوان دەمایەوە ئینجا دابەش دەکرا بەسەر خەڵکەکەدا تا لە دوایدا وای لێهات ئەوەندە تالانیەکە زۆر ببو عمر سوێند خواردبوو ووتبوی خوا تەمەنم بدات هەتا ئەوشوانانەی بە شاخەکانی سەنعاوە مەڕ دەلەوەڕێنن من دەبێ موچە یان بۆ ببڕمەوە.ئەم پیاوەتیەو ئەم عەدالەتەی عمر باس دەکرێت بەم جۆرەبوە بەشەڕو کوشتارو تالانی دەکرا لە وولاتان سەرانەیان لەهەزارەکانی وولاتان کۆ دەکرایەوە دەکرا بە قورگی عەرەبی جەزیرەدا کاتێ سوپای عەرەبی موسڵمان هەڵی دەکوتایە سەر هە وولاتێک سێ مەرجی بۆ دادەنا ١ موسڵمان بون ٢ سەرانە دان ٣ شەڕو تالانی کردنی ماڵەکانیان. مەرجی یەکەمیان هیچ کەسێک پێی قبوڵ نەکراوە هەروا بە ئاسانی واز لە دینی باو باپیرانی بێنێت بێتە سەر دینێک کە زۆر نامۆیە بۆی عەرەبی لێی تێناگات .خۆ کاتیشیان دانەناوە بۆیان تا لە دینەکە بگەن بە شمشێرێکەوە بە سەرسەرانەوە وەستاون دوایان لێ کردون هەر ئێستا موسڵمان بن ئەم مەرجەش ئاستەم بوە قبوڵکردنی محمد کە وەحی بۆهات اللە سینەی محمدی پاک کردبۆوە لە گوناحە ئامادەی کردبوو بۆ پێغەمبەرایەتی لە سەر ئەوە شەوە یەک مانگ لەرزو تای گرت قسەکانی اللەی پێ قبوڵ نەکرا بە ئاسانی هەتا کەوتە پرس و ڕاوێژ تێیان گەیان. (تۆ بڵی کورد لە محمد زووتر موسڵمان بو بێت؟)هەروەها لە گەڵ ئەوەی دینەکە بە زمانی عەرەبی هاتبوو بانگەوازەکەشی هەر لە ناو عەرەبدا لەناو کەسوکارەکەی خۆی دابووله سەر ئەوە شەوە ٢٣ ساڵ و ٢٨ شەڕی وویست تا دینەکەیان پێ

قبوول بكات ،وواته مەرجی یەکەم وەک بیانویەک بەکار هاتوە.ئێستا مەرجی دوەم و سێیەم دە مێنێتەوە لە هەردو مەرجەکەدا عەرەبی موسڵمان سود مەند بوو ئەوەی ئیسلامی قبوڵ نەبوایە یان سەروماڵیان تاڵان دەکرد بەشەڕ یان سەرانەیا بە زۆر لێ دەسەندن و دەیان برد بۆ عمر. لە سەردەمی عمردا هاوەڵەکانی (سەحابە)محمد زۆر دەوڵەمەند ببون سەحابەی واهەبوو خاوەنی هەزارەها کۆیلەو کەنیزە بوو کە لە شەڕەکاندا گیرابون کەنیزەکانیان لە بازاڕدا دەفرۆشت و کۆیلەکانیش لە دەست ڕەنگینەکان بوون بە ڕۆژ دەیان ناردن بۆ کار کردن ئێوارانیش دەهاتنەوە بۆ ئەوەی ئەو باجە بدەنە گەورە کانیان کە بەسەریاندا سەپاندبوویان پێی دەووترا باجی کۆیلایەتی برێکی زۆرکەم لەو پارەیە دەمایەوە ژیانێکی کولە مەرگی پێی دەژیان هەر گیز بەو جۆرە نەیان دەتوانی ئازادی خۆیان بکڕنەوە دەبوایە هەر بە کۆیلەی بژین کە سکاڵایان دەکرد لەلای عمری عادلی موسڵمان لە دەست خاوەنەکانیا بەهیچ جۆرێک گوێی لێ نەدە گرتن لە بەر ئەوەی گەورەکانیان هاوەڵی محمد بوون و باوەڕداری موجاهید بوون. بەڵام کۆیلە جگە لە نەفرەت شیاوی هیچی تر نین.سەحابەی وا هەبوو(٤٠٠)چوارسەد هەزار درهەمی ئەو سەردەمە و هەروەها١٠٠٠ئەسپ و١٠٠٠ کۆیلەشی هەبوو.دەست کەوتی عەرەبێکی پروادار لە کوردستان گەشتە١٠٠٠دینار١٠٠ئەسپ و١٠٠٠٠ سەرمەڕ.سەحابەی دەست پاکی وا هەبوو دوای مردنی ئەوەندە ئاڵتونو زیوی هەبوو بە قاڵبی گەورە نەوەکانی بە تەور دەیان شکان دابەشیان دەکرد ئەمە بێجگە لەومولکو ماڵەی کە بە سەد هەزار دینار مەزەندە دەکرا..

کوشتنەکەی عمرچۆن بو کۆیلەیەی فارس بەناوی ابو لؤلؤە بوو کە کۆیلەی مغیرە بن شعبە بوو لە سەر نا داد پەروەری خاوەنەکەی چەند جارێک شکاتی کردبوو لەلای عمر بەڵام عمر گوێی پێ نەیابوو لە کۆتایدا ابو لؤلؤە عمر دەکوژێت لە سەر نایەکسانی عبیداڵلەی کوری دەر دەپەرێتە دەرەوە لە تۆڵەی باوکی کۆمڵێک عەجەمی (غەیرە عەرەب )بێتاوان دەکوژێت کە هیچ پەیوەندیەکیان بە کوشتنەکەی عمرەوە نەبوە منالیشیان تیا بوە تا ئەنسارەکان فریا دەکەون دەستی دەگرن هیچ لێپرسینەوەیەکی لەگەڵ دا ناکرێت بۆ ڕۆژی دوایی دوا دەکەن لە عمر کە جێ نشینێک دانێ بۆخۆی ئەویش شەش کەس هەڵ دەبژێرێت لەوانە عثمانی کورعەفان وعلی کوری ئەبو تالیب ،عەبدورەحمانی کوری عەوف،سەعدی کوری وەقاس،تەلحەی کوری عەبدوڵلا،زوبێری کوری عەوام خستە ژورێ کەوە پێی ووتن لە ناو خۆتانا یەکێک هەڵ بژێرن عبیداڵلەی کوری خۆی لەگەڵ یەکێکی تر بە شمشێرەوە بوەستێت بەسەریانەوەشەش ڕۆژ لەوێ بمێنەوە نابوایە بۆماوەی سێ ڕۆژ کەس سەردانیان بکات .ئینجا عمر بە شمشێر بە دەستەکەی ووت چاودێریان بکە ئەگەر هاتوو چواریان ڕازی بوو بەیکێکیان ،دانەیەکیان ڕازی نەبوو ئەوا یەکسەربدە لە ملی ئەو دانەیە.ئەگەر هاتوو سیانیان ڕازی بوون بە یەکێکیان

دوانیان ڕازی نەبوون ئەوا بدە لەملی ئەو دوانە ئەگەر نیوە بە نیوە وەستانەوە ئەوا عبیداڵلەی کوڕم بکە بەحەکەم با لایەکیان هەڵ بژێرێت ئەگەر هاتوو سێ ڕۆژەکە تەواو بو کەسیان هەڵ نەبژارد سەری هەموویانم بۆ ببڕە. عمری کوڕی خەتاب بەزمانی شمشێرحوکمی کردوە.ئێستا دەتوانم بڵێم عومەری کوڕی خەتاب و سەحابە دەست پاکەکان دەناسن ئەمانە هاتون کوردی زەردەشتی فێری خواپەرستی ڕەوشتی بەرزو دەست پاکی بکەن.

## سەرچاوەکان


الخلافة الراشدة.

سقوط المدائن (الطبعة الثالثة سنة ١٩٨٤). أحمد عادل كمال. دار النفائس.

قصة عمر بن الخطاب - موقع قصة الإسلام

الفاروق عمر بن الخطاب - محمد رضا

فصل الخطاب في سيرة ابن الخطاب أمير المؤمنين عمر بن الخطاب شخصيته وعصره - علي محمد الصلابي

موسوعة فقه عمر بن الخطاب - محمد رواس قلعه جي

رسائل الفاروق ص٧٩ رساله رقم ١٠٦

رسائل الفاروق ص٨٢ رساله ١١٤

رسائل الفاروق رساله رقم ١٠٧،تاريخ الطبري

بروانەمسعودی،مروج الذەهب؛ نقلات عن.سادق عرجون

بروانە صالح العلي،التنظيمات الاجتماعية والاقتصاديةل٢٤٣

عمر بن الخطاب وابو سفيان صخر بن حرب

١ ^.الطبقات الكبرى، تأليف: ابن سعد، ج٣، ص٢٦٥.

٢ ^.محض الصواب في فضائل أمير المؤمنين عمر بن الخطاب، ج١، ص١٣١.

٣ ^.سيرة ابن هشام

٤ ^.تاريخ الطبري. الجزء الرابع

بەشی شازدەهەم

جەنگە سەخت و خوێناویەکەی ئەزمێر لەنێوان خالیدی کوری وەلید و فەیروزی کوری شائەژدەردا

)امام واقدی بەیەکەم مێژوونوسی موسڵمان ناسراوە و پسپۆر بووە لەژیاننامەی محەمەد(

امام واقدی ئاوا ئەم مێژووە دەگێڕێتەوە:، لە موسای ابن عەقبەوە ووتی: پاش ئەوەی خالیدی کوری وەلید، هەواڵی سەرکەوتنەکەی بەرامبەر فروخ شا و دەستکەوتەکانی شەڕ لەکوڕوکچی بە کۆیلە کراو و زێرو زیو و مەڕ و مالات و ڕەوە ئەسپ و ڕاخەر و گەنم و جۆ و ڕۆن، پێک هاتبوو، هەمووی گەیاندە عومەری کوری خەتاب. ئەویش، زۆر خۆشحاڵ بوو بەسەرکەوتنەکانیان. هەمووی کردە بەیتولمالەوە. دوایی زۆر دادپەروەرانە دابەشی دەکرد بەسەر عەرەبەکانی حیجازدا. هەروەها لەسەر داوای خالیدی کوری وەلید، خەلیفە عومەر، سەربازی زیاتری بۆرەوانە کرد. تا بەهێزێکی باشەوە بەرەنگاری شا ئەژدەر ببێتەوە.

کاتێ یەکە سەربازیەکان گەشتنە خالید، دەنگی اللەاکبر بەرز بۆوە. خالید و سەرکردە سەربازیەکان، بە گەشتنی سوپا تازەکە زۆر دڵ خۆش بوون. تاکە کێشە کە ڕووی تێکردبوون کەمیی جێگە بوو لەناو قەڵاکەدا. قەڵاکە، لە جێگەیەکی سەخت دروست کرابوو. جێگەکەیان زۆر تەسک بوو. ئەو هەمووسەربازەی هەڵ نەدەگرت. بۆیە بەناچاری لەقەڵا هاتنە خوارەوە. لەوێ خێمەکانیان هەڵدا، تاکو بۆجەنگی داهاتوو، لەدژی شائەژدەر،خۆیان ئامادە بکەن.

خالید، نامەیەکی بۆ شا ئەژدەر نوسی و تێیدا، دوای لێ کردبوو کە بێتە سەر دینی ئیسلام و ئەگەر ئیسلامی قبوڵ نییە ئەوا دەتوانێت لە سەر دینی خۆی بمێنێتەوە. بە مەرجێ، جزیە( سەرانە)، بەعەرەبی موسڵمان بدات. ئەگەر بەهیچ کام لەم مەرجانە ڕازی نەبێ ئەوا دەبێت خۆی بۆ جەنگی ڕووبەڕووبوونەوە، ئامادە بکات. ئەوکاتە سەرو ماڵتان دەبێتە دەستکەوتی شەڕ(غەنیمە.(

نامەبەر، نامەکەی بردوو چووە لای شا ئەژدەر. یەکێک لە وەزیرەکان، دوای لە نامەبەرەکە کرد نامەکە بخوێنێتەوە تاهەمووان ئاگاداری ناوەڕۆکی نامەکەبن.

نامەبەر، نامەکەی خوێندەوەو شا ئەژدەر، ڕوویکردە ئامادەبووان. بە پێکەنینێکی گاڵتە جاڕیەوە ئاوڕی دایەوە بۆ یەکێک لە دانیشتوانی دیوەخانەکەی، کە پیرێکی زەردەشتی بوو. پێی ووت: گەورەی بڕواداران، دەتوانی پێم بڵێیت ئەوەی ئێمە دەیپەرستین ناوی چیە و کێیە؟

پیری زەردەشتی، لەوەڵامدا ووتی: میرم، ناوی ئاهورامەزدهایە و سەرچاوەی پاکی و جوانی و خۆشەویستی و ئاشتی و ئاوەدانیە. خوای چاکەیە.

دووبارە شا پرسیاری کردەوە و ووتی: خوا فەرمانی بەچی پێ کردوین؟

پیر، لەوەڵامدا ووتی: بیری چاک و ووتەی چاک و کرداری چاک، میرم.

شا، ووتی: ئەی بۆئەم بەرد پەرستانە هاتوون فێری خوا پەرستیمان بکەن؟ خۆ باوباپیرانمان هەر تاک پەرست بوون؟

یەکێک لە وەزیرەکان، ووتی: میرم، عەرەب، تازە خوای بۆ دەرکەوتووە!

هەمووان، دەستیان کرد بە پێکەنین و پاشان، شا ووتی: کەواتە، پێی بڵێن، ئێمە، خواپەرستین. خاوەنی بەرنامەیەکی پاک و بێ گەردین. کتێبیشمان زەند و ئاوێستایە. هەموو یاساکانی ژیانی تێدایە. گەورەی بڕواداران، تۆ هەرگیز بیستووتە زەردەشتی پەیامبەرمان. لەپێناوی پارەدا، لەسەر فەرمانەکانی خوا، سازشی کردبێت؟

پیری زەردەشتی، وەڵامی شای دایەوە و ووتی: میرم، بە دڵنیایەوە نەخێر. یاساکانی ئاهورا مەزدا، بەپارە ناگۆردرێتەوە.

شا ووتی: کەواتە ئەم عەرەبانە چۆن ئاینێکیان هێناوە بە لەشکرێک سەربازەوە هاتوون هەندێ قسەی عەرەبی دەکەن کە کەس لێیان تێ ناگات؟ شمشێریان لە سەر ملمان داناوەو پێمان دەڵێن ئەم ئاینەمان لێ قبوڵ بکەن، ئەگەر قبوڵتان نییە لەبری ئەوە دەبێت جزیە بدەن واتە(سەرانە) . ئەگەر پارە نەدەن، دەکوژرێن؟ کەواتە ئامانجەکەیان پارە کۆکردنەوەیە نەک چەسپاندنی یاسای خوا. چۆن دەکرێت مامەڵە بکرێت بەپەیامی خواوە؟ کە دڵ نیام ئەم ئاینە لە خواوە نە هاتووە! ناکرێت پەیامی خوا بە شەڕو مرۆڤ کوشتن بڵاوبێتەوە.

شا ئەژدەر، داوای لەنوسەرەکەی کرد کە بە خالیدی کوری وەلید بڵێن ئامادەین بۆ شەڕکردن. یان لە خاکی کوردان وەدەرتان دەنێین یان لەسەر ئەم خاکە دەکوژرێین. ئێمە، سەرانە نادەین و سەرشۆری قبوڵ ناکەین. تۆڵەی ئەو هەموو سوکایەتیەتان لێدەکەینەوە لە بەرامبە ئێمە کردتان.

سوپاکەی شا ئەژدەر، بە سەرکردایەتی فیروزی کوری و چەند سەرلەشکرێک، کە پێک هاتبوو لە میرە کوردەکان. کە هەر یەکەیان بە هێزێکەوە هاتبوون بۆ بەشداری کردن لە شەڕەکەدا و کۆی سەربازەکانیان پانزە هەزار سوارە و پیادە بوو، ڕوویان کردە دەشتی ئەزمەڕە، لەلای گوندی ئەزمەڕە. کە ئێستا پێی دەڵێن (بردەشان). خێوەتیان هەڵدا و خۆیان ئامادەکرد بۆ ڕوو بە ڕوو بونەوەی سوپای عەرەبی موسڵمان.

نامەبەر، بە نامەکەی شا ئەژدەرەوە گەیشتە سوپای موسڵمانان وخالید، نامەکەی خوێندەوە و زۆر بەڕقەوە ووتی: چاوەڕوانی وەڵامێکی لەوە باشترم نەدەکرد. ئەم کوردە کەللەڕەقان، سوور بزانن دەکوژرێن، واز لە کەللەڕەقیی خۆیان نا هێنن.

خالید، کەوتە پاڕانەوە و ووتی: خوایە، زەلیلی دەستی کوردمان نەکەی. سەرمان بخەیت بەسەریانداو سەروماڵیان بکەی بەغەنیمە(تالآنی شەڕ.(

خالیدی کوری وەلید، بەپەلە، هەموو سەربازەکانی کۆکردەوە و دوای لێکردن کە خۆیان ئامادە بکەن.

سوپاکەش، بنەو بارگەیان تێک ناو ڕوویان لەمەیدانی شەڕکرد. لە دەشتی ئەزمڕە لە سەر گردێک بەرامبەر بەسوپای کورد، خێوەتیان هەڵدا.

دەمەوئێوارە بوو. خالید، داوای لە سوپاکەی کرد کە شەو زووبخەون بۆ ئەوەی بەیانی باش بجەنگن. هەروەها بە چەند سەربازێکی ووت دەبێت بێداربن و چاودێری هەڵسوکەوتی دوژمن بن.

بۆ ڕۆژی دوایی، هێشتا ڕۆژ نەکەوتبوو. ئێشک گرێک، خالیدی ئاگادار کردەوە کە سوپاکەی فیروز، جموجوڵیان تێکەوتووە. وادیارە خەریکی خۆ ئامادەکردنن.

خالید، فەرمانی کرد، ئۆردوگاکەیان بپێچنەوە و خۆیان ئامادەکەن بۆ شەڕێکی خوێناوی. هێشتا تارمایی سوپاکەی فەیروز دەرنەکهوتبوو سوپای عەرەب ئامادەی جەنگ بوون.

خالید، لە پێشی سوپاکەوە دەهات و دەچوو. بەدەنگی بەرز، هاواری دەکرد و قسەی بۆ سەربازەکانی دەکرد. بەئایەتەکانی جەنگ و جیهاد، وورەی بەرز دەکردنەوە. خالید ووتی: سەرکەوتن بۆ ئێمەیەو سەرو مالیشیان دەبێت بە غەنیمە(دەست کەوتی شەڕ). سەربازەکان بە یەک دەنگ هاواریان کرد اللّٰه اکبر.

خالید، چەند سەر لەشکرێکی بانگ کرد. لەوانە، (ئەمیر زرار و فضلی کوری عباس و عبدالرحمان ابو بكري صديق)بوون. دوایلێکردن کە هەر سەر لەشکرێک دەبێت بە چەند سەربازێکی بەتواناوە چاو بخەنە سەر میرە کوردەکان و ئامانجیان بەتەنها کوشتنی میرەکان

بێت و هیچ کارێکیتر نەکەن. تا بەو جۆرە ورەی جەنگاوەرکوردەکان، پروخێنن. کاتێ کە دەبینن میرەکەیان لەبەر دەمیاندا لە خوێنی خۆی دا گەوزاوە.

لە بەرامبەردا، سوپای کورد، ریزی جەنگیان بەست. فەیروزی کوری ئەژدەر، سوپاکەی کرد بە پێنج بەشەوە. چوواربەش بۆ قۆڵەکان و ناوجەرگەی سوپا. بەشێکیش، بۆ یەدەک.

جەنگاوەرە کوردەکان، ڕم و نێزەیان پێ نەبوو. هەموویان چەکی کورتیان پێ بوو. بەڵام کاتێ کە سوپای کورد ئەو هەموو سەربازە عەرەبەیان بینی کە ژمارەیان چەندین جار لەمان زیاتربوو، خەریک بوو وورە بەربدەن و بشڵەژێن. بەڵام، فەیروزی کوری شا ئەژدەر و میرە کوردەکان هاتنە پێش سوپاکەوە و شمشێرەکانیان دەرهێنا.

فەیروز، هاواری کرد و ووتی: من ئامادەم لە پێناوی خاک و ئاینی باوباپیرانمدا، سەرم دانێم. ڕووی کردە سەربازەکان و هاواری کرد: ئێوە دەزانن ئەگەر ئەم عەرەبە شەڕەنگێزی خوێن ڕێژانە سەرکەون چیتان لێدەکەن! خۆتان دەکوژن ماڵ و منداڵتان بەتاڵانی دەبەن. جا بۆیە داواتان لێدەکەم، مەردایەتی بنوێنن. مەهێڵن عەرەب، لە ژێر ناوی فەرمانی خوادادا ژن و منداڵتان بکەن بە کۆیلەو لە بازاڕەکاندا مامەڵەیان پێوە بکەن. کوردینە، هونەری خۆتان بنوێنن. ئەمە شەڕی مان و نەمانە. من، بەڵێنتان دەدەمێ کە خۆم و میرەکان، لە پێشی ئێوەوە بجەنگین.

جەنگاوەرەکان، هەموو هاواریان کرد: درود بۆ ئاهورا مەزدا.

سوپای عەرەب دەستیان کرد بە هێرشکردن تا تەواو نزیک بوونەوە. لەبەرامبەردا، سوپای کورد توانیان بە قۆچەقانیی بەرد، موسڵمانان بەرد باران بکەن و ژمارەیەك سەرباز بریندار بکەن. دووابە دووای ئەوان، تیرهاوێژەکان، هاتنە پێشەوە و دەستی خۆیان وەشاند و توانیان پاشەکشە بەسوپای عەرەبی موسڵمان بکەن.

خالید، لە دوورەوە چاودێری شەڕەکەی دەکرد. ئەم جارە، فەرمانیکرد، هێرشی سەرتاسەری بکرێت.

هەردوو سوپاکە، وەک دوو دەریا، ڕووەویەکتر شەپۆلیان دەدا. تێکەڵ بەیەکتر ببونو سوپای کورد، لەناو سوپای عەرەبدا وون ببون.

ئەو رۆژە، شەڕێکی وا ڕوویدا، ئەگەردووای سەدساڵ ئەوەی لەوێوە ڕەت بووایە، وایزانی کە لەم شوێنەدا شەڕێکی خوێناوی گەورە ڕوی داوە. لە بەر ئەوەی ئەوەندە مرۆڤ و ئەسپ کوژرابوو ڕێ نەبوو هەنگاو بنێی لەبەر لاشە.

سەرچاوەکان

فتوح سواد العراق محمد واقدی وەرگێرانی عبدالعزیزواعظی

طبقات ابن سعد

کوردستان و ئایینی ئیسلام مەلا ڕەوف سەلیم حوێزی

بەشی حەڤدەهەم

) امام واقدی بەیەکەم مێژوونوسی موسڵمان ناسراوە،موسای ابن عقەبەوە زانا بو بە ژیانامەی محەمەد(

امام واقدی ئاوا ئەم مێژووە دەگێرێتەوە موسای ابن عقەبەوە ووتی : ئەو ڕۆژە هەتا ئێوارە شەڕ بەردەوام بوو. مەیدانی جەنگ، پرببوو لە لاشەی جەنگاوەرە سەر پراواکان و دەست و قاچ پەڕیوەکان و سک هەڵدراوەکان. هاوارو ناڵەی بریندارەکان گوێیان کەڕ دەکرد. دەستەکان ئەوەندە لینجیی خوێنی پێوەبوو، ئیتر گرتنی دەسکی شمشێر و تەورەکان ئاستەم بوو. چەند جارێ سوپای عەرەب هەوڵیدا گەمارۆی سەربازە کوردەکان بدات. بەڵام، نەی توانی.

سوپا یەدەکەکەی میرزادە فەیروز، هەمووجارێ گەماڕۆکەیانی دەشکاند .تاریکی شەو ڕێگر بوو لە بەردەوام بونی شە ڕەکە سەربازەکانیش لەهیلاکیا لە پەل وپۆ کەوتبوون. خۆیان بەپێوە نەدەگرت. تا تەواو تاریک داهات جەنگ بەردەوام بوو. پاشان، وردە وردە هات و هاواری گۆرەپانی جەنگیش نەما و هەردووسوپاکە کشانەوە بۆ بنکەکانی خۆیان.
خالیدی کوڕی وەلید، فەرمانیکرد، بریندارەکان هەڵگرنەوە و کوژراوەکانیش هەر لە جێی خۆیاندا بەخاک بسپێرن. لەبەرزۆری لاشەکان، چاڵی درێژیان هەڵ دەکەند و هەرچاڵێک، کۆمەڵێك لاشەی کوژراویان تێ دەکرد. لاشەی کوژراوەکان ئەوەندە زۆر بوون بۆرۆژی دواییش هەر خەریکی ناشتنیان بوون.
.شەو، لە دوورەوە لەبەر ڕۆشنایی مانگەشەو سەیری مەیدانی شەڕەکەم دەکرد. لەپڕێکدا تارمایی سەرو قاچی ئەو ئە سپانەی کە بریندار کرابوون دەردەکەوتن. کەتۆزێ هێزێکیان تێدا مابوو. دەجووڵان و شەڕیان لە گەڵ مەرگدا دەکرد. دوایی بۆیەکجاری لە جوڵە دەکەوتن. دڕندە کێویەکان تەواو تێربببوون لەخواردنی دەست وقاچە پەڕیوەکان.
خالید، ووتی: من شەڕم زۆر کردووە. لە کورد چاو نە ترستر و ئازاتر وفێڵ بازترم نەبینیوە. لە مەیدانی جەنگدا وەک ڕمی چەقیو وان بەڕووماندا و سڵ ناکەنەوە لە مردن.
پاش ڕۆژێک لە پشودان، خالید، فەرمانیکرد، چەند یەکەیەکی سەربازی ڕووبکەنە ئاواییەکانی ناوچەکە بۆتاڵان کردنیان.
ماوەیەک بوو، لەسەر تاڵاتی، کێشەیەکی گەورە دروست ببوو لەناو سوپای عەرەبە موسڵمانەکاندا. بۆیە، خالید، دەبوو ڕێگە چارەیەک دانێت بۆئەو کێشەیە و پێشنیاری کرد، هەرسەربازێک لە کاتی تاڵانی کۆکردنەوەدا، یەکەم کەس دەستی بە هەرشتێک کەوت، لەدەست کەوتی بچووک، ئەوە موڵکی خۆیەتی. کەس ناتوانێ بەزۆر، لێی بسەنێت. بەڵام، دەبێت پێنج یەکی بۆ اللە و ڕسول بێت. هەروەها، فەرمانی پێکردن، هەرکەسێک لە گوندنشینەکان، دەستی هێنایە ڕێیان، یەکسەر بیکوژن.
عەرەبە موسوڵمانەکان، دەبوایە ئالیکی باش، بۆ ئەسپەکانیان، پەیدا بکەن. بۆ ئەوکارەش، شوانکارە کوردەکانیان بەکاردەهێنا و بەزەبری هێز. بۆیە، سوپاکە ڕووی لە هەلایەک دەکرد دەغڵودانی ئەوناوچەیەیان بە سمی ئەسپەکانیان دەشێلاو دەیان کردە لەوەڕگای ئەسپەکانیان. خەڵکی لادێکان بە هەموو جۆرێک بەگژیاندا دەچونەوە بەدارو بە بەردو بەتەورو بە شمشێر هەتا لادێکەیان دەبووە ئاگرو یەک پارچە دەسوتا. دانیشتوانەکەشیان دەکردنە کۆیلە.
شازادە فەیروز، دەستی کرد بە ڕێک خستنەوەی لەشکرەکەی کەزیانێکی گەورەی بەرکەوتبوو. هەستی پێ کردبوو کە کارێکی باشی نەکردبوو لە دەشتاییا بە سوپایەکی کەمەوە ڕووبە ڕووی سوپایەکی زەبەلاحی وەک سوپاکەی خالید بوەتەوە. سوپاکەی شازادە فەیروز، وەک سوپاکەی خالید خاوەن ئەزمونی شەڕ نەبوون. سەربازەکانی، زۆربەیان جوتیاری ناوچەکەبوون و هەرگیز مەیدانی شەڕیان نە بینی بوو. هیچ هۆکارێکیشیان نەبوو کە پێشتر ببنە سەرباز تا مەشقی سەربازی بکە ن وببنە جەنگاوەر. بوون بە سەربازیش زیاتر خۆی لە بەرگری کردن لە سەرو ماڵ و دینەکەیان وبەگژدا چوونەوەی سوپا دڕندەکەی عەرەبی ئیسلامیدا خۆی ڕایەڵە کردبوو.
جارێک، خالید، دەگات بەچەند پیاوی کورد وپێ ووتبوون، بۆنابنە سەربازی من. دەستکەوتی باشتان دەست دەکەوێت؟ بە پێکەنینەوە وەڵامیان دابۆوە و ووتیان، ئەوەندە مەڕوماڵاتمان هەیە چەندین نەوەمان دەتوانێ لێی بخوات. بۆیە ئێمە، سەربازی بۆ کەس ناکەین و نامانەوێت لەماڵ و منالمان دورکەوینەوە. ئەگەر هەمان قسەی بە عەرەبێکی بیابانشین بگوتایە، بێ یەک و دوو یەکسەر دەبووە سەرباز. لە بەر هەژاری. بۆ نمونە، عەرەبە هەڵگەڕاوەکان کە دووایی بە زەبری شمشێر کرانەوە بە موسڵمان، بۆماوەیەکی زۆر داوایان دەکرد کە بەژداری شەڕەکانی ڕۆم و فارسیان پێ بکەن. تا ئەوانیش سودمەند بن لە تاڵانی وولاتان. بۆئەوەی کەمێک ڕزگاریان بێت لە برسێتی و هەژاری. بەڵام، عومەری کوڕی خەتاب، لە پێشدا ڕێی پێ نەدان وەک سزایەک.

ئەمە، جیاوازیی نێوان سوپای کوردو سوپای عەرەب بوو. سەربازە کوردەکە، باکی نەبوو لەخواردن. هەمووشێک لە بەردەستیا بوو. بەڵام، سەربازە عەرەبەکە خوێنی خۆی دەڕشت و دنیای کاول دەکرد، تەنها بۆ پارویەك نان و تا بیکات بە دەمی منداڵەکانیەوە. هەمووشتێکی دەکرد لەو پێناوەدا.
بۆجاری دووەم، هەردوو سوپاکە بەرامبەر بەیەک وەستان. میرزادە فەیروز، زۆر هەوڵیدا شەڕەکە بەرێتە لای شاخ و دۆڵەکان. هیچ نە بێت، مەیدانی جەنگەکە بەرتەسک بکاتەوە و بەر لەو هەموو سووپایە بگرێت تا بە بەربڵاوی هێرش نەکەن. بەڵام، سوپای عەرەب نەکەوتە ئەو داوەوە و ئەو ڕۆژەش شە ڕ هەر بەردەوام بوو. میرهورمز، کە میری قیرەوان بوو.
ئەو ڕۆژە، بە خۆی سوپاکەیەوە نەبەردیان نواند و دروێنەی سەربازە عەرەبەکانیان دەکرد. هێرش لەسەر هێرشی دەکردە سەریان. خالید، خالید کە چاوی لێبوو ئەمە یەکێکە لە میرە کوردەکان. چاوی کردبووە سەری. داوای کرد لە زراری ئەزور، کە لەگەڵ یەکە تایبەتییەکەیدا پرۆن و میرهورمز بکوژن. نا بێ بەهیچ جۆرێ لە چنگیان ڕزگاری بێت. ئەوەبوو، لە نیوەڕۆی ئەو ڕۆژەدا، لە گەرمەی شەڕدا. زرارو یەکە تایبەتییەکەی، توانییان خۆیان بگەیەننە میر هورمز و چوواردەوری بگرن و ڕمێک بکەن بە سنگیدا و بیکوژن. هەموویان بەجارێ کەوتنە اللە اکبر و ئەو ڕۆژە چەندەها لاشە کەوتبوو بە یێسەر. خوێن فوارەی دەکرد.
چاوەڕوانی بەشی هەژدەیەم بن
سەرچاوەکان
فتوح سواد العراق محمد واقدی وەرگێرانی عبدالعزیزواعظی
طبقات ابن سعد
کوردستان و ئایینی ئیسلام مەلا ڕەوف سەلیم حوێزی
تاریخ عصر الراشدین

ئەنفالی کوردان لەژێر سێبەری شمشێردا.

بەشی هەژدەهەم

ئیمام واقدی بەیەکەم مێژوونوسی موسڵمان ناسراوە، موسای ابن عقەبەوە زانا بو بە ژیانامەی محەمەد) امام واقدی ئاوا ئەم مێژووە دەگێرێتەوە:
لە موسای ابن عقەبەوە ووتی: میرفەیروز، کوژرانی قیروان میری ڕەبت بە چاوی خۆی بینی،بۆیە بە پەلە خۆگەیاندە سەربازەکانی ئەو میرە کوردە تا وورە بەر نەدەن لە میدانی جەنگ هەڵ نەیەن. کەوتە نەعەرەتە لێدان و هاواری کرد. ورە بەرمەدەن کورانی شاخ خۆڕاگر بن وەک دار بەڕووەکان کە ڕەگەکانیان بە ناخی ئەم خاکەدا ڕۆشتوە ئاخرپێم نالێن کەی کورد لەمەیدانی جەنگدا هەڵ هاتووە؟ ئێوە، لەشکری چاکەن دژی بۆگەنی تاریک پەرستان دەجەنگن ئاخر کەی ئاهورا مەزدا پشتی لە خراپەکاری ئەهریمەن کردوە ؟ ڕوو لە ڕوناکی خوا بکەن. تاریکی تێک بشکێنن. ئایا ئێوە دەزانن ئەم عەرەبە بەرد پەرستانە لەشکری ئەهریمەنن هاتوون سەروماڵتان بە تاڵان بەرن . بتان بینم مەردایەتی بنوێنن.
هەموو هاواریان: کرد درود بۆ ئاهورامەزدا .
ئای لە دەهۆڵ کوتەکانیش چ جۆش وخرۆشێکیان دابو بە مەیدانی جەنگەکە کەوای لە جەنگاوەران دەکرد هەتا مردن بجەنگن. هەرچەندە گۆڕەپانی جەنگەکە پانتایەکی فراوانی هەبوو. بەڵام ئەو ڕۆژە مرۆڤەکان وەک گەڵای دار هەڵ دەوەران بەسەر یەکدا لە هەمووجێیەک لاشە کەوتبوو. سەبازە تیرهاوێژە کوردەکان هەوڵیان دەدا بە تیرەکانیان ئەسپەکانی دوژمن بپێکن تا سوارەکان ببن بە پیادە ئەوسا لەناو بردنیان ئاسان دەبوو. هەر سوارێک بکەوتایە

بەخێرای لە ناویان دەبرد.
خالید بەوە ناسرابوو لە هەموو شەڕەکانیدا یەکەم کارێک کە پێی هەستاوە دروست کردنی یەکەیەکی سەربازی تایبەت بوە بۆ لێدان و کوشتنی میرو سەر کردە سەر بازیەکانی دوژمن بوو بەم پلانە دەیتوانی ورەی سەربازەکان بروخێنێ جەنگەکە یەک لا بکاتەوە لە بەرژەوەندی خۆی زۆربەی کاتەکانیش سەرکەوتو دەبوو لە پلانەکەیدا لەم جەنگەشدا بە هەمان شێوە.خالیدی کوری وەلید لە دورەوە سەیری شەڕەکەی دەکرد دەگەڕا بە دوای میرەکوردەکان تا یەک یەک دەست نیشانیان بکات لە کاتی گونجاودا پلانەکانی جێبە جێ بکات لە ناویان بات.
ئەوە بوو سەیریکرد پشێوییەک دیارە بە ڕیزی جەنگاوەرە کوردەکانەوە. زەردەخەنەیەکی بۆ کردو ووتی: من ئەمەم دەویست . هەمووشتێک بە دڵی من دەچێت بەڕێوە. من زۆر بەلامەوە سەیرە کوردەکان بەم هەموو ئازایەتیەوە بەرگری دەکەن بەگژ ئەم سوپا زەبەلاحەی من دا دێنەوە سڵ ناکەنەوە لە مردن،بە ڵام ئەوەی منی سەر سام کردوە بە نیوە ئازایەتیەکەیان پلانی شەڕ کردنیان نیە تەواو نامۆن پێی .
خالید فەرمانی کرد بە عبدورەحمانی کوری ئەبو بەکری سدیق سەربازەکانی بەرێت و هێرش بکاتە سەر میر فەیروز و هەروەها فەزلی کوری عەباسی ئاگادار کردەوە کەبە خۆی و یەکە سەربازە تایبەتەکەیەوە خۆیان بگەیەنە شای مەنگوران. بیان کوژن و سەرەکانیان بهێنەوە.
پێی ووتن: پەیمانتان دەدەمێ کاتێک کە سەرکەوتین هەرچی پێتان خۆش بوو بیکەن سەروماڵیان غەنیمی شەڕەا. ڵڵە لەپشتمانە..
پلانەکە بەو جۆرەی کە داڕێژرابوو جێبە جێ کرا ، فەزلی کوری عەباسی یەکە تایبەتەکەی برد گەمارۆی شای مەنگورانیان دا پاش شەڕێکی دەستەو یەخە وبەرگریەکی بێ وێنە ،سەربازەکان لە پێشەوە پەلاماریان داو فەزلی کوری عەباس لە دواوە ڕمێکی چەقاند لە پشتی لە سنگیەوە نوکی ڕمەکەی سەری دەرهێنا فەزلی کوری عەباس لە ئەسپەکەی دابەزی سەری شای مەنگورانی پڕی و کردی بەسەری ڕمەکەیەوە بەرزی کردەوە هەموویان کەوتنە اڵله واکبر.
شای مەنگوران ڕەوانی پیرۆزی بەرەوئاسمان باڵی گرت وهەواڵی بیری خراپ و ووتەی خراپ و کرداری خراپی عەرەبە موسڵمانە مرۆڤ کوژەکانی بە ئاهورە مەزدا گەیاند.
ئەمیر عبدولڕەحمانی کوری ئەبو بەکری سدیق بە پێی پلانەکە، خۆی گەیاندە میر فەیروزکوری شا ئەژدەر. بە شێوەیەکی کەوانەی یەکەکە هێرشیان کرد. هەتا میر فەیروز کەوتە بازنەی هێرشەکەیان. دوایی هە تا دەهات بازنەکەیان بچوک دەکردەوە و میر فەیروزیان داپڕی لە پاسەوانەکانی تا دواجار هەموویان بەیەک جار هێرشیان کردە سەری.
میر فەیروز، لەبەرئەوەی دەیتوانی دەستی چەپ و ڕاست وەک یەک بە کار بێنێت هیچ کەسێک نەی دەتوانی بە تەنیا لەگەڵی بە شەر بێت. تەور لە دەستێکی بوو و لە دەستەکەی تری شمشێری پێ بوو. شەڕێکی زۆر نە بەردانەی کرد. چەند کەسێکی لێ کەلە پاچە کردن و لێ کوشتن. کەس نەیدەوێرا ڕوو بەڕوو، بەرەنگاری بێتەوە. هەتا دەهات بازنەی گەمارۆدانەکەی بچوک دەبۆوە تا لە دواوە عبدورەحمانی کوری ئەبو بەکری سدیق، فرسەتی لێ هێناو شمشێرێکی دا لە ملی و سەری پەڕاند. ڕەوانی پیرۆزی میرفەیروز بە نەمری وەک باڵندەیە بەسەر دەشت و دەری کوردستانا تائێستا دەفڕێ.
هەواڵی ئەو کۆمەڵ کوژیەی ئەو ڕۆژگارە بە گوێی نەوەی نوێی کوردا ئەچرپێنێ. بە قورگێکی پڕ لە گریانەوە دەڵێت نەوەکانمان! تکایە ئەنفالکردنی کەسوکارەکانتان وەک ئەنفال کردنەکەی ئێمە پیرۆز مەکەن.
سەربازە کوردەکان، کە سەری میرەکانیان بینی بەسەر ڕمی عەرەبەکانەوە ورەیان بەرداوهەندێکیان هەڵهاتن بەرەو چیاکان. ئەوانی تریش تا دووا هەناسە، جەنگان.
شەڕ هەتا درەنگانێکی ئێوارە بەردەوام بو داڵە گۆشت خۆرەکان ئاسمانی ناوچەکەیان تەنی بووورده ورده دەنگی شمشێرەکان و خڕەی خڕی زرێپۆشەکان وهاواری جەنگاوەران کەم تردە بووشەڕەکە کۆتای هات.ئەمیرخالید بریاری دا کە بە تاریکی دوای سەربازە کوردەکان نە کەوێت کەڕوویان لەشاخەکان دەکرد لەترسی تیرهاوێژەکانیان .باشتر وابووپشویەکیان پێ بدات جارێکی تر سوپا رێک بخاتەوە بۆ جەنگی داهاتو ئەو شەڕە بە خوێنی هەزارەها گەنج ولاوی کورد کۆتایی هات زۆر بەی جەنگاوەرە کوردەکان لەمەیدانی جەنگدا کوژران لە پێناوی خاکی نیشتمان داخەکم ئەمڕۆلە جێی ڕێزو پێ زانین گۆڕەکانیان بۆتە شوێنی تف و نەعلەتی

بەردبارانی نەوەکانیا دەست خۆشی ستایش کردنی بکوژەکانیان.!
چاوەڕوانی بەشی نۆزدەیەم بن
سەرچاوە
فتوح سواد العراق محمد واقدی وەرگێرانی عبدالعزیزواعظی
طبقات ابن سعد
کوردستان و ئایینی ئیسلام مەلا ڕەوف سەلیم حوێزی
گێرانەوەی لە دەمی خەڵکی ناوچەکە

ئەنفالی کوردان لەژێر سێبەری شمشێردا.

بەشی نۆزدەیەم

) امام واقدی بەیەکەم مێژوونوسی موسڵمان ناسراوە، لەموسای ابن عەقەبەوە کەزانا بوو بە ژیانامەی محەمەد) ، ئاوا ئەم مێژووە دەگێڕێتەوە، موسای ابن عەقەبەوە ووتی: سوپاکەی خالید ،لە مەیدانی شەڕەکەدا، لە خۆشیی دەسکەوتەکانی شەڕ، کەوتنە اﷲاکبر. خێرا کەوتنە کۆکردنەوەی. لە وبەینەدا، یەکێک لە سەربازەکان، هاواری لێ بەرز بۆوە و ووتی: فریا کەون! ئەمیر زراری کوری ئەزوەر، لێرە کەوتووە و بەسەختی بریندار کراوە. زۆر خوێنی لەبەر دەڕوات.

خالید و هاوەڵەکانی هاتنە سەری و زۆری بۆ گریان. خالید، فەرمانیکرد کە سەربازە دیلەکان و خەڵکی ناوچەکە بێنن و بە زۆرەملێ کاریان پێ بکەن. بۆهەڵ کەندنی گۆرو بە خاک سپاردنی موسڵمانە کوژراوەکان. کێلی گەورە گەورەیان بۆدانان و هەروەها چاڵێکی گەورەشیان هەڵکەند و هەموو سەربازە کوردە کوژراوەکانیان تێکرد. ناویان نا گۆڕی کافرەکان. هەروەها، خالید، داوای لە خەڵکی ناوچەکە کرد، دەبێت بە دەستی خۆیان ئەو گۆرە بەردباران بکەن. بۆ ئەوەی ببێت بە پەندێک بۆ ئەوانەی بەگژ سوپای عەرەبی موسڵمان دەچنەوە.

دوایی دواکرا لە سەربازە دیلەکان، کە موسڵمان بن. ئەوانیش وتیان ڕازی نین واز لە دینی باو باپیرانمان بێنیـن کە لێواولێوە لە مرۆڤ دۆستی. ئێستا نایگۆڕنەوە بەدینی ئیسلام. خالید ووتی بۆئێمە چیمانە؟ کوڕێکی تازە پێگەشتووی بێباک لە ژیان لە مردن سنگی پیایە کێش و ووتی جا شێک ماوە لە دڕندەیی بێ ڕەوشتی نەیکەن بە نەفرەت بن ئایین وا بڵاوکراوەتەوە بەدزی بەتاڵانی بە ژن وکچ فڕاندن ئەتانەوێت خوا بە ئێمە بناسێنن لەقسەکانی تەواو نەببو لەملیان دا.

لەبەرامبەر ئەم ڕەتکردنەوەیەدا، خالید ووتی: کەواتە ئەوە دەکەم کە اﷲ دەیەوێت. ( فَلَمْ تَقْتُلُوهُمْ وَلَـكِنَّ اللّهَ قَتَلَهُمْ وَمَا رَمَيْتَ إِذْ رَمَيْتَ وَلَـكِنَّ اللّهَ رَمَى وَلِيُبْلِيَ الْمُؤْمِنِينَ مِنْهُ بَلاء حَسَناً إِنَّ اللّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ} واته، ئێوه ئەوانتان نەکوشت! بەڵکو، اﷲ کوشتنی. تۆ بەردو خوڵت نەکرد بە دەم و چاویاندا، اﷲ کردی. اﷲ وویستی پرواداران بەم هۆیەوە بەچاکی تاقی بکاتەوە. بەڕاستی اﷲ، بیسەرێکی زانایە.سورة الأنفال: ١٧ پاش ئەوە، خالید، فەرمانی کرد کە لەسەری هەموویان بدەن.

پاش ماوەیەك لە ڕێکخستنەوەی سەربازەکان، خالید، فەرمانیکرد کە ڕوو بکەنە ئاوایی (قرە بابان ). ئەم ئاواییە، هەر بەناوی گەورەی ئاواییەکەوە ناو نرابوو. ئەم پیاوە، زۆر دەوڵەمەند بوو. هەروەکو پاشاکان هەڵسوکەوتی دەکرد. خاوەنی موڵکو ماڵێکی زۆر بوو. زۆرجار بەگژ میرەکاندا دەچووەوە و سەری بۆکەس شۆر نەدەکرد.

لە پشتی ئەم ئاواییەوە، ڕووبارێکی گەورە لەشاخەکەوە دەهاتە خوارەوە. لە بەری ئاواییەکەش باخ و باخاتێکی زۆر هەبوو. هەتاکو بن قەڵا، درێژ دەبۆوە. بەڵام، ئێستا ئەو ئاواییە ناوەکەی گۆڕاوە و ناوی قەرەتەپەیە. نەلە جێگەکەی جارانی ماوە و نە ئاوی هەیەو نە باخەکانی ماوە.

قرە بابان، هەر کە هەواڵی بۆ هات کەوا سەربازەکانی عەرەب، بۆ شەڕ و تاڵانی، ڕوویان لە ئاواییەکەیان کردووە. هەر زوو، داوای لەخەڵکەکەی کرد، ئەوەی دەستی چەک دەگرێت دەبێت بەرگری بکات لە ژن وکچ ومناڵەکانیان و نە هێڵن عەرەبی بەرد پەرست بیانکەن بەدەستکەوتی شەڕ و بۆ ڕابواردنی خۆیان بەکاریان بهێنن. و، ووتی دەستی لەشکری ئەهریمەن ببڕن و نەهێڵن پێی گڵاویان بخەنە ناو ئاواییەکەمانەوە.

هەر کە ئەم هەواڵە، لەناو ئاواییدا، بڵاو بۆوە، ژیانی ئاسایی سەروژێر بوو. زریکەو قیژەی کچان و ژنان و گریان و کڕوزانەوەی منداڵان و هاوارهاواری پیاوان، هەموولایەکی تەنی. سەگەکان، لە هەمووو جێ یەک دەوەڕین. هەر ژن بوو پەلاماری منداڵەکەی دەداو لەگەڵ چارۆکەیک ناندا، مەڕو ماڵاتیان پێش خۆیان دەدا و ڕووەو چیاکان ڕووەو ئەشکەوتو بن بەردەکان هەڵ دەهاتن.

ئەو ڕۆژە، دەوت گوت دەرگای دۆزەخ کراوەتەوە لە خەڵکی بێوەیی ئاوایی قرەبابان. موبیدێکی زەردەشتی، چووە  ئاگرگەکە و لەوێ چەند لقەدارێکی سەندلی بۆندارو تاشراوی هەڵگرت. لە سەر بڵێسەی ئاگرەکە، داینا. بەبێ ئەوەی دەستی بۆ ببات، بە مەقاشێک چاودێری دەکرد. دەستی کرد بە خوێندنەوەی نزاو سرودەکان. پاش ماوەیەک، سەری بەرز کردەوە و ووتی: سەیرە، ئەم ئللەیەی عەرەبەکان گوێ ڕایڵی بوون و کردویانە بەخوای خۆیان، نازانم بۆ خۆشی و ئاسودەیی و ئارامی مرۆڤی ناوێ؟ لە پێناوی ئەودا، هەرچی خوا پێی ناخۆشە دەیکەن. خوێنی مرۆڤ دەڕێژن. ماڵی هەژاران تاڵان دەکەن. کوروکچمان دەبەن و بازرگانی پێوە دەکەن. ئەی خوداوەند، خۆتۆ سەرچاوەی پاکی و چاکەو ڕاستیت، تۆ بڵی، ئەم خەڵکە کەگەواهی ناکۆکی و جەنگی نێوان ڕاستی درۆن، وازیان لە ڕاستی هێنا بێت و درۆ هەڵبژێرن؟ ئەمانە، چۆن ئەهریمەنیان کردووە بە سەرقافڵەی خۆیان؟ جیهان بەرەو تاریکی و وێرانکاری دەبەن.

پیری زەردەشتیانی ئاوایی قرەبابان، لەگەڵ خودای خۆیدا، لەم گفتوگۆیانەدابوو، دەنگی هات هاتی پیاوانی ئاوایی هاتە گووێی. سەرێکی کێشایە دەرەوە. لە هە موو لایەکەوە جەنگاوەران، خۆیان زرێپۆش کردبوو و بە شمشێرو تیرو تەورەوە، بەرو باخی بەردێ، ڕایان دەکرد. هەندێکیان لە سەر لقی داربەڕوەکان جێگیر ببوون و هەندێکی تریان لە پشت گابەردەکانەوە خۆیان مات دابوو. تا لە کاتی شکست هێناندا، بەرگری بکەن. لە ئاواییەکەیان، ژمارەیەك لە سەربازەکانی شازادە فەیروز، کە لە شەڕەکەدا هەڵهاتبوون و پەنایان بۆ بەر ئەم ئاواییە هێنابوو، ئێستا ئەمانیش وەک خەڵکی قرەبابان، ئامادەی بەرگرین، هەموویان بە سوار و بەپیادە، بە ڕێکەوتن بۆ دەرەوەی ئاوایی و بەرامبەر بەلەشکری عەرەب، دامەزران.

گەورەی ئاوایی قرەبابان، کە سەرلەشکر بوو، لەپێشەوە وەستابوو و هاواری دەکرد: ئەمرۆ، ئێمە، بەجەستە و گیانی خۆمان، دەبینە حەساری ئاواییەکەمان. رێگا نادەین لەشکری ئەهریمەن وێرانکاری بۆ وولاتمان بهێنێت.

جەنگ، لەنێوان، هەردوو سوپادا، دەستی پێکرد. هەرلە بەیانیەوە هەتا نیوەڕۆ، خەڵکی ئاوایی قرەبابان بەرگریەکی بێ وێنەیان کرد. مە یدانی جەنگیان پڕ کردبوو لە لاشەی عەرەبی موسڵمان.

قرە بابان، خۆی، بە ئەسپەکەیەوە هەڵ دەسوڕا و هاواری دەکرد: ڕەوانم قوربانی جەنگاوەرانی چیا بێت. دەستیان لێ مەپارێزن.

جەنگ، لەوپەڕی لوتکەدا، بەردەوام بوو. ئاسمان، لەبەر تەپوتۆزی پێی ئەسپەکان دیار نەمابوو. دەم و چاوەکان، بە خوێن سواخ درابوو. هەر سەربوو دەپەری. هەر مرۆڤ بوو بێ گیان دەکرا. هەتا دەهات، خالید، سەربازی زیاتری ڕەوانەی جەنگەکە دەکرد. پاش نیوەڕۆ، تەرازوی شەڕەکە

لە بەرژەوەندیی سوپای عەرب هەڵ گەڕایەوە. سوپا بێشومارەکەی خالید، لە هەموولایەکەوە هێرشیان کردە سەر ئاواییەکە. دەمەو ئێوارە، توانییان قرەبابان بکوژن و دەست بەسەر ئاوایەکەدا بگرن.

کۆمەڵێ لە سەربازە کوردەکان، ڕووەو چیاکان، هەڵهاتن. هەر ئەو ئێوارەیە، خالید، فەرمانی کرد، ئاواییەکە تاڵان بکەن. هەرچیەکیان بەردەست کەوت، دەستکەوتی شەڕە و حەڵاڵیان بێت. ئاواییەکەش بروخێنن بەسەر لاشە کوژراوەکاندا.

خالید، فەرمانیکرد،ئاگرگەکەیان بروخێنن و ئاگرکەیان خامۆش بکەن. لەملی پیاوانی ئاینیان بدەن. بەم جۆرە شەڕەکە کۆتایی هات.

بۆشەو، چوون بۆسەرچاوەی ڕوبارەکە و لە وێ خێوەتیان هەڵدا. خالید ووتی: ئەمڕۆ، کوژراوێکی زۆمان هەبوو. لە کوژرانی ئەو هەموو سەربازەی، زۆر بێ تاقەت ببوو. بۆیە، بەتورەییەوە ووتی: ئێرە ناخۆشترین جێگەیە لە هەموو جیهاندا. خەڵکەکەشی پیسترین کەسن. بە هیچ جۆرێک دینی ئێمەیان قبوڵ نیە. من لەکورد ئازاترم نەبینیوە !
ئەو شەوە، لەوێ خێوەتیان هەڵداو خەوتن.

عبداڵله کوری امیە ضمري، کە ناسراوبوو بە (عبداڵلە ئەمەوی)، ووتی: چوار شەو لەو جێگەیە ماینەوە. شەوی کۆتایی، من هۆشیار بووم. دەبوایە ئێشک بگرم. لە نیوەشەودا، لە سەرشاخەکە، چاوم بە ڕووناکی کەوت. ئاگرێکی زۆر، بەکۆمەڵ داگیرسا. منیش، هەتاتوانیم هاوارم کرد، (نفیر النفیر) و هەموویانم ئاگادار کردەوە. بە پەلە هەموومان زرێپۆشەکانمان لەبەر کرد و سەر کەوتین بۆ سەر چیا. دەبوایە بەپێ سەرکەوین. چونکە ڕێگەی ووڵاخ نەبوو.
سەیرمانکرد کۆمەڵێکی زۆرن. بەمۆمەوە هاتوون بە دوای کوژراوەکانیاندا دەگەڕێن. هەر کە ئێمەیان بینی، مۆمەکانیان فرێ داو تیر بارانیان کردین. ئێمە پاشەکشەمان کرد و ئەوان هێرشیان بۆهێناین. زۆر داخ لەدڵ بوون. شەڕێکی گەورە لەنێوانماندا ڕوویدا. کەس نەیدەزانی کێ شمشێر لە کێ دەدات! بەپەلە ووشەی نهێنیمان دروست کرد و بەکارمان دەهێنا بۆ ئەوەی یەکتر بناسینەوە. ئەویش ووشەی (یا منصور) بوو. هەر لە نیوە شەوەوە هەتا بەرە بەیان، شەڕ بوو. هیچ هەواڵێکی یەکترمان نەدەزانی. نەماندەزانی چەندمان کوشتووە و چەندمان لێ کوژراوە. کە ڕۆژ بووەوە، کوردەکان، کشانەوە.

سەر ئەو شاخە، زۆر سارد بوو. دارستانێکی چڕی هەبوو. ئەمیر خالید، فەرمانیکرد، دوایان بکەوین و تۆڵەی ئەو هەموو کوژراوەیان لێ بسێنین. ئێمەش، دوایان کەوتین. هەتا نزیک دێیەکی بچوک. لەوێ کوردەکان، دوبارە بۆمان گەڕانەوە و شەڕێکی گەورە ڕوویدا. لە هەموو لایەکەوە تیربارانیان کردین. تیرێکیان نا بەسنگی عبداڵلەی کوری ئەیوبی ئەنصاری و هەر لەوێدا گیانی دەرچوو. هەروەها، سێ سەد هاوەڵی تریان لەو جێگەیەدا کوشت.

ئەمیر خالید، هێرشەکانی زیاتر کرد. سەربازی زیاتری ڕوانە کرد بۆ شکاندنی کوردەکان. تا توانییان پاشەکشە بکەن بە سوپای کورد. کاتێک خالید و هاوەڵەکانی بە کوژرانی عبداڵلەی کوری ئەیوبی ئەنصاریان زانی، زۆر گریان. چونکە، عبداڵله، لە گەورە پیاوانی ئەنصاری بوو. هەرلەلای ئەو دێ بچوکەوە، بە خاکیان سپاردن. ئێستا، گۆڕەکانیان وەک شایەت حاڵێک ماونەتەوە بۆ ئەوەی کە بزانرێت ڕۆژێک لە ڕۆژان شەڕێکی گەورە ڕوی داوە لە ناوچەکە و کوردەکان بە گژ ئەنفالچیە موسڵمانەکاندا چونەتەوە. ئیسلامیان پێ قبوڵ نەبووە.

دووای سەرکەوتنیان، سوپای عەرەبی موسڵمان، کەوتنە تاڵانکردنی ناوچەکە. ئەو ژن و کچ مناڵانەی لە ترسی سوپای ئیسلام خۆیان شاردبۆوە، بە مەڕو ماڵات و سەروەت و سامانەکانیانەوە هە موویان، بوون بە دەستکەوتی شەڕ. بە پێی شەرعی اڵله، کچە کانیان دابەش کرد بە سەر سەحابەکاندا.

سەرچاوە

فتوح سواد العراق محمد واقدی وەرگێرانی عبدالعزیزواعظی

طبقات ابن سعد

کوردستان و ئایینی ئیسلام مەلا ڕەوف سەلیم حوێزی

گێرانەوەی بەشێکی ئەو مێژووە لە دەمی خەڵکی ناو چەکە

ئەنفالی کوردان لەژێر سێبەری شمشێردا.

بەشی بیستەم

(امام واقدی بەیەکەم مێژوونوسی موسڵمان ناسراوە، لەموسای ابن عقەبەوە کەزانا بوو بە ژیانامەی محەمەد، دەیگێڕێتەوە و دەڵێت):
پاش هەڵهاتنی سوپای کوردان و بەجێهێشتنی گوندی سەرچیا، ناوچەکە، کەوتە دەست سوپای عەرەبی موسڵمان. ئەمیر خالید، فەرمانی کرد کە لەوجێیە پشوو بدەن و خۆیان ڕێک بخەنەوە. ماوەی سێ ڕۆژ لەوێ مانەوە. خالید، داوایکرد کە هەموو دەستکەوتەکانی شەڕ کۆبکەنەوە و بیهێننە بەردەمی تاکو بەپێی یاساکانی قورئان، بەسەریاندا، دابەشی بکات.
ئەویش، لەسەر ڕوناکیی ئەم ئایەتە(واعلموا أنما غنمتم من شيء فأن لّله خمسه ولّلرسول ولذي القربى واليتامى والمساكين وابن السبيل ). واتا: هەرچیەکتان دەست کەوت لە تاڵانی، پێج یەکی بۆاڵلە ومحمدوخزمان و هەتیوان و هەژاران و ئەوانەی لەڕێگا ماون.
خالید، کەوتە دابەشکردنی تاڵانیەکان. دەستکەوتەکان، ئەوەندە زۆر بوون، لە ژمارە نەدەهات.
بەشی خواو محەمەدیان لێ جیاکردەوە و هەرزوو ڕەوانەی کرد بۆ خەلیفە عومەر و ئەوەی مایەوە لە کوڕوکچی منداڵ و ئاژەڵ و خواردەمەنی و ئەسپ، دابەشیکرد بەسەریانا. بەشی خۆشی هەڵگرت.
ئەو کورو کچانەی لە خۆیان زیاد بوو دەبرانە بازاری کۆیلەو لەوێ دەفرۆشران. ئەمەش بەپێی شەرع، حەرام نیە. چونکە کافرن و دەستکەوتی جەنگن...
دوای نیوەڕۆ بوو، ئەمیر خالید و سەحابەکان، لە سەرچیا، لە سەرکانی وئاوێک دانیشتبوون.
سەربازەکانیش خێوەتیان هەڵدابو. وولاخەکانیان لەوناوە دەلەوەڕان. لەناکاو، هەواڵگرێک هات و هەواڵی بۆ ئەمیر خالید هێنا. پێی ڕاگەیاند، کە لە خوار چیاوە دێیەکی گەورەوە هەیە نزیک گرمکان. لە نزیک زێی بچووکە. ئێستا، لەشکرێکی زۆری کورد کۆبۆتەوە و لەوە دەچێت نیازیان باش نەبێت و خەریکی خۆ ئامادە کردنن. نزیکەی ٦٠٠٠ سەربازێک دەبن.
خالید، هەر ئەم هەواڵەی بیست، فەرمانی بەزراری کوری ئەزوەر و عبدرحمانی کوری ئەبوبەکری سدیق کرد کە ٦٠٠سەرباز بەرن و پرۆن بۆ چاودێری کردنی هەڵسوکەوتی لەشکری کورد و لەهەموو جوڵەیەکیان ئاگادارم کەنەوە. ئێمەش، وردە وردە بەرەولای ئێوە دێین.
زرارو عبدلرحمان، بۆ ڕۆژی دوایی تاریک ورِوون خۆیان ئامادە کردو بەرەو سنوری لەشکری کورد، کەوتنە ڕێ. لەلایەن کوردەکانەوە دیار بوو، ئەوان، تیمی هەواڵگرییان هەبوو و ئاگاداری هەموو هەڵسوکەوتەکانی سوپای عەرەبی موسڵمان بوون. بۆیە، زۆر بە ئاگاوە چاودێریی جموجوڵەکەی زرارو عبدولرحمان بوون.
هەر لە چیا هاتنە خوارەوە چوار دەوریان گرتن. هێرشیان کردە سەریان و شەڕێکی گەورە ڕویدا.
عبداڵلەی ئەنس، لە گەمارۆکە خۆی دەرباز کردو بە پەلە خۆی گەیاندە ئەمیرخالید. هەواڵی شکستە کەیانی پێ ڕاگەیاند.
خالید، زۆر بەپەلە سەربازەکانی کۆکردەوە و کەوتە ڕێ. بەڵام، کوردەکان توانییان ژمارەیەکی زۆر سەربازی عەرەب بکوژن. زراری کوری ئەزوەریش لەگەڵ کۆمەڵێک سەرباز دیل بکەن. بەڵام عبدرحمانی کوری ئەبوبەکری سدیق، تاکو خالید، گەیشت، توانیی بەرگری بکات.
کەخالید گەیشتە لایان، ووتی: ئەترسم ئەم کوردە بێ غیرەتانە هەموویانیان سەرپری بێت.

خالید، سەیری کرد، عبدرحمانی کوری ئەبوبەکری سدیق، بە چەند سەربازێکەوە بەرگری دەکات و دەیەوێت هاوەڵەکانی ڕزگار بکات. کەوتە اللە اکبر و هیرشی بۆ بردن. هاواری کرد (اللە هم انظر الي ابن ابي بکر). واتە: خودایە بەچاوی بەزەییەوە تەماشای کوری ئەبو بکر بکە. فەزلی کوری عباس و عبداڵلەی کوری عومەری خەتاب و زوبیری عەوام و مقدادی ئەسوەد وعبداڵلەی ئەنەس، بەدووایدا هێرشیان کرد. شەڕەکە تا دەهات گەورەتر دەبوو. عەرەبەکان، توانیان ، زرار، ئازاد بکەن.

ئەورۆژە، پاڵەوانانی کورد، شەڕێکی قارەمانانەیان کرد. هەردوو لەشکر، تێکەڵ دەبوون بەیەک وەك شەپۆلی دوو دەریا وابوون. سوپای عەرەبی موسڵمان، چەند یەکەیەکی تریان لەچیا هاتنە خوارەوە. خۆیان گەیاندە شەڕەکە. جەنگاوەرە کوردەکان، لەو شەڕەدا گورزیان پێبوو لەهەر کەسێکیان بدایە، لە پەل و پۆیان دەخست. هەندێکی تریان بە تەور شەڕیان دەکرد. ژمارەیەکی زۆریان تیر هاوێژ بوون کە چە کێکی زۆر کاریگەر بوو. زیانی گەورەی دابوو لە سوپای ئیسلام. خالید، سەیری کرد یەکێك لەکوردەکان سەر لەشکرە. هانی جەنگاوەرە کوردەکان دەدات. فەرمانی کرد بە عبدالرحمان، بیکوژێ. ئەویش، بە خۆی و چەند سەربازێکەوە خۆی گەیاندە ناوەڕاستی شەڕەکە. گەمارۆیان داو عبدالرحمان ڕمێکی لە سنگی داو کوشتی.

سەربازە کوردەکان، کە بەمەیان زانی، لە مەیدانی جەنگ کشانەوە. هەنێکیان هەڵهاتن و سوپاکەی خالید، دوایان کەوتن. هەندێکیان کوژران و هەندێکیان لە ئاوی زێ دا خنکان. لەو شەڕەدا، ٣٠٠ جەنگاوەری کورد کوژران و ١٠٠ جەنگاوەریشیان بە دیل گیرا. بەڵام، ژمارەی کوژراوەکانی سوپای عەرەبی موسڵمان، نەزانراوە. ناوی ئەو سەر لەشکرە کوردەش نەزانراوە و باس نەکراوە.

گوندەکانی ئەو ناوە بوون بە دەستکەوتی شەڕ. هەموویان تاڵان کرد. بەتایبەتی ئاوایی گرمکان. هەرچی تیابوو تاڵانیان کرد. دەنکێ گەنمیان جێنەهێشت بۆ خاوەنەکانیان. تەنانەت کەلوپەلی بەری سەربازە کوژراوەکانیشیان دادەکەند و وەک تالانی دەیان برد.

خەڵکی ئەوگوندانەی بەرەنگاری لەشکری عەرەبی موسڵمان ببوایەتەوە، ئەوەی موسڵمان نەبوایە یا جزیەی نەدایە، ئەوا خانوەکەیان بەسەردا دەڕوخاندن و سەروماڵیان بە تاڵان دەبردن و ڕووبەڕووی مەرگ دەبونەوە.

چاوەڕوانی بەشی بیست و یەک بن

سەرچاوە

فتوح سواد العراق محمد واقدی وەرگێرانی عبدالعزیزواعظی

طبقات ابن سعد

کوردستان و ئایینی ئیسلام مەلا ڕەوف سەلیم حوێزی

گێرانەوەی بەشێکی ئەو مێژووە لە دەمی خەڵکی ناو چەکە

## ئەنفالی کوردان لەژێر سێبەری شمشێردا.

بەشی بیست و یەك

ئیمام واقدی ،بەیەکەم مێژوونوسی موسڵمانان ناسراوە، لەموسای ابن عەقەبەوە ، کەزانا بوو بە ژیانامەی محەمەد، ئاوا ئەم مێژووە دەگێڕێتەوە:

واقدی دەڵێت: کاتێک لەشکری ئیسلام دەستی گرت بەسەر تەوای ناوچەکە دا، خالید، فەرمانی کرد، بە سوپای عەرەبی موسڵمان، ڕووبکەنە دووگۆمان.

سوپا، بەدەم زێی بچوک دا هاتنە خوارەوە هەتا گەیشتنە دەربەندی پشدەر. مالکی ئەژدەر، سوپایەکی گەورەی پێکەوە نابوو. زۆر داخ لەدڵ بوو. داوای لە هەموو فەرماندەکان کرد، کە هەمووئاوایەکانی سەر ڕێگەی لەشکرەکەی خالید چۆڵ بکەن. ژن و مناڵەکانیان ڕەوانەی قەندیل بکەن. ئەوەی دەتوانێت شەڕ بکات، بیکەنە ڕیزی سوپاوە. ئەو ووتی: نامەوێت بە هیچ جۆرێک لە هیچ جێگەیەک ڕووبەڕووی لەشکری عەرەب ببنەوە. بە تایبەتی شەڕی پێدەشتم

ناوێ . ئەوان زۆرن و ئێمە کەمین. هەتا دەتوانن ڕووەو دۆڵ و چیاکان پەلکێشیان بکەن. هەتا بۆتان دەکرێت خۆتان بپارێزن لە شەڕ کردن. با بە بێ ترس بێنە ناو دۆڵەکەوە. ئەوکاتە، شەڕی ئێمە و ئەوان لەو دۆڵەدا یەک لا دەکەمەوە. سوێند بە ئاوێستا ڕەوانی پیسیان و بیری خراپیان و ووتەی خراپیان و کرداری خراپیان، ڕەوانەی دۆزەخەکەی ئەهریمەن دەکەم.... هەموو بە جارێ هاواریان کرد: درود بۆ ئاهورا.

بۆ ڕۆژی دووایی، هەموو شتەکان بە پێی پلانەکەی شا ئەژدەر بەڕێوەچوو. هەموولادێکانی ئەو دەوروبەرەیان چۆڵ کرد. بەدووگۆمانیشەوە. ژن و مناڵ ومەڕوماڵاتیان ڕەوانەی چیای قەندیل کرد. لەوێ، دەواریان بۆ هەڵدان.

خەڵکی ناوچەی گرتک، دووگۆمان، زەنگڵان، مەڕدارییان دەکرد. لە هاویندا دەچوونە کوێستانەکانی قەندیل و لە زستاندا دەگەڕانەوە لادێکانیان. بەڵام، ئەم جارەیان بنەو بارگەیان تێک نا. بە مە بەستی پاراستنی ئایروو و هێشتنەوەی کولتوری کورد. بۆ بەنەمری هێشتنەوەی ئاینی پیرۆزی کورد بوو.

ئەو ئێوارەیە، شا ئەژدەر ئارامی لێ پرابوو هەردەهات و دەچو. وئارەق بە ناوچەوانیدا دەهاتە خوارەوە. لەبەر خۆیەوە قسەی دەکرد و دەیووت: فەیروز، کوڕم، بینایی چاوان. تۆڵەت لەعەرەب دەسێنم. چۆن ئازاریان دایت، ئازاریان دەدەمەوە. چۆن بێ گیانیان کردی بێ گیانیان دەکەمەوە. هەرواەدەکەم. فەیروز کورە گەورەکەم. فروخ شا، برازاکەم، ڕەوانتان شادیێت بەیانی ...ئا بەیانی، هەموو دنیا سەرو ژێر دەکەم. تۆڵەی ئەو هەموو گەنجە قارەمانەتان لێ دەسێنم . بەیانی لاشەی ساردی بکوژەکانتان دەبینم.

خالید، لە نزیک دەربەندی پشتدەر، سەربازگەی دانا . ڕووی کردە هاوەڵەکانی و ووتی: ئەم کوردانە، چیان لێ هات؟ ئەرز قوتی دان، ئاسمان هەڵی کێشان؟ کەس نابینم بەرەنگارمان بێتەوە! هە تا گوندەکانیشیان چۆڵ کردوە.

عبداڵلەی کوری عومری خەتاب، ووتی: کارێکمان پێ نەکردون تا بوێرن جارێکی تر بەرەنگارمان ببنەوە.

خالید، فەرمانی کرد ٢٠٠٠٠ بیست هەزار سەرباز ڕەوانەی دوگۆمان بکەن. بۆ لێدانی سوپای شا ئەژدەر.

سوپاکەی شا ئەژدەر، بەنهێنی، ئەم بەرو ئەوبەری دۆلەکەیان گرتبوو. لەسەر هەموو دار بەڕویەک و لە پشت هەموو گا بەردێک، بە تیرو کەوانەوە، چەند سەربازێکی دانابوو. کۆمەڵێک سەربازیشی ئامادە کردبوو، لە سەرەتاو لە کۆتایی دۆڵەکە، خۆیان مەڵاس دابوو. تاکو، کاتێ کە سوپاکە هاتنە ناو دۆڵەکەوە، ڕێی گەڕانەوە و دەربازبوونیان لێبگرن.

پاش ئەوە، شا ئەژدەر، فەرمانی کرد: کەس خۆی ئاشکرا نەکات ،هەتا هەموولە شکرەکە دێنە ناو دۆڵەکەوە.

بە یانی زوو بوو. خالید، سەربازەکانی کۆکردەوە و کەوتە قسەکردن بۆیان، بەم ئایەتە دەستی پێکرد.{فَإِذا لَقِيتُمُ الَّذِينَ كَفَرُوا فَضَرْبَ الرِّقَابِ حَتَّى إِذَا أَثْخَنتُمُوهُمْ فَشُدُّوا الْوَثَاقَ فَإِمَّا مَنًّا بَعْدُ وَإِمَّا فِدَاء حَتَّى تَضَعَ الْحَرْبُ أَوْزَارَهَا ذَلِكَ وَلَوْ يَشَاء اللَّهُ لَانتَصَرَ مِنْهُمْ وَلَكِن لِّيَبْلُوَ بَعْضَكُم بِبَعْض وَالَّذِينَ قُتِلُوا فِي سَبِيل اللَّهِ فَلَن يُضِلَّ أَعْمَالَهُمْ} سورة محمد:٤( ئەگەرتوشی کافرەکان هاتن لەملیان بەن. ئەگەربریندارببوو بەدیل بیان بەن. یان، بە جزیە یان بە خۆرایی هەتا شەڕ تەواو دەبێت خوا خۆی ئەتوانێت سەرتان خات بەسەریاندا. بەڵام ئەتاندا بە یەکدا، بۆ ئەوەی ئەوکەسەی لە پێناوی ئەودا دەکوژرێت ئەجریان بە خۆرایی نەڕوات( .

سوپا، هەموو، بەیەکجار، کەوتنە اللەو اکبر.

پاشان، پێی ووتن :وەکو خۆتان دەبینن، کوردەکان چۆن لەترسی ئێمە هەڵهاتوون! جێ نییە خۆیانی تیا بگرن. ئێستا ئێوە ڕووله دووگۆمان دەکەن. دەمەوێت سەری شا ئەژدەرم بۆ بێننەوە. سەروماڵی ئەو کوردە کافرانەش غەنیمەی شەڕەو حەڵاڵی ئێوەیە. ئەو هەموو زەوی و زارە، ئێوە دەبنە خاوەنی. خاوەنەکانیشیان دەبنە کۆیلەی ئێوە. ئێوە، دەزانن اَللە فەزلی ئێوەی عەرەبی موسڵمانی بەسەر کوردی کافردا داوە. داواتان لێدەکەم، بڵاو ببنەوە بەخاکی کافراندا. ئێستا بە ڕێکەون بەرەو سەرکەوتن. اَللە یاوەرتانە.

لەشکرەکە، جوڵەیان تێکەوت، بەرەو دوگۆمان، کەوتنەڕێ. کەمێکی مابوو بۆ نیوەڕۆبوون، لەشکرەکە، گەشتنە گرتک - زەنگڵان - دوگۆمان سەیریان کرد چۆڵ کراوە. کەسی تیا نییە. دوایی، ڕویان کردە دۆڵەکە. کەئێستا پێی دەڵێن دۆڵی شەهیدان. دۆڵەکە، تەنگەبەرو چڕو پڕلەدارو دەوەنە بوو. لەشکرەکە، هەستیان بە هیچ شتێکی گوماناوی نەکرد. تا دووایەکی پیادە هەنگاویان نایە ناو دۆڵەکەوە. ئەوە هە ڵەیەکی زۆر کوشندەبوو بۆ سوپای عەرەبی موسڵمان. کاتێک بە خۆیان زانی، لە هەموولایەکەوە بەرد هاڕەی دەکردو دەهاتە خوارەوە. لە شکر، بەجارێ شپرزە بوو. بەهەموولایەکدا هە ڵ دەهاتن. تەنانەت ڕێگەی دەربازبوونیش نەمابوو. دووای ئەوان تیر هاوێژەکان دەستی خۆیان وەشاند. ئاسمانی دۆڵەکەیان بە تیر چنی بوو. سەربازی وا هەبوو چەند تیرێکی پێوە بوو. شا ئەژدەر، لە سەر گابەردێکی گەورەی بڵند وەستابوو. هاواری دەکرد: کوڕانی پشدەر، بتان بینم. ئەمڕۆ ڕۆژی تۆڵەیە. نامەوێ تەنها یەک سەربازیان بەرێوەی ڕزگاری بێت. ئەمانە، هاتوون تاڵانی بکەن و کورو کچمان بکەن بە کۆیلە و کەنیزە. تازە ئەم دۆڵە گۆڕی ئێوەیە.

ئەوڕۆژە، هەتا ئێوارەی رۆژی دووەم، شەڕ بەردەوام بوو. وردە وردە دەنگی هاتوهاوار کەم بۆوە. ئەوەی ڕزگاری بوو، تەنها چەند ئەسپێکی بێ سوار بوو. ئەورژە (٢٠٠٠٠) بیست هەزارسەربازی عەرەبی موسڵمان کوژران. تەنها یەک سەربازیان ڕزگاری نەبوو.

خالید، لەسەربازگەکەی راوەستابوو. چاوەڕێی هەواڵی سەرکەوتن بوو. ئەوەندەی زانی چەند ئەسپێکی بێ سوارە ڕوویان لە سەربازگەکە کرد. کە ئەوەی بینی، هەستی کرد کارەسات قەوماوە. بەپەلە، چەند یەکەیەکی بۆسیخوری ڕوانەی ناوچەکە کرد. شەو، یەکەکان، بەنا ئومێدی و بەدڵتەنگی ڕویان کردە خالید و ووتیان، کوردەکان، لەسەر هەموو لوتکەی شاخەکان ئاگری سەرکەوتنیان کردوّتەوە. خالید، بەبیستنی ئەم هەواڵە، هاواری کرد: چۆن ئەبێ ئێوە ئێستا تەنیا یەک سەربازیشتان نە بینیبێت؟ هەموویان سەریان داخست.

ئەوشەوە، لەشکرەکەی خالید، کەوتنە ئامادە باشیەوە. ترسیان لێ نیشت. پشێویەکی زۆر کەوتە ڕیزەکانی سوپای عەرەبی موسڵمانەوە. خالید، دەبوایە بە زوترین کات کاردانەوەی هەبوایە بەرامبەر بەو شکستە گەورەیە. بۆیە داوای لە سەرلەشکرەکان کرد باسەربازەکانیان لەسەربازگەکە کۆکەنەوە و خۆیان بۆ دژە هێرشێکی کتوپر، بە هەموو هێزەکانیانەوە ئامادەبکەن. هەروەها، دەبوایە هەموو ئەو یەکە سەربازیانەی کە بە ناوچەکەدا بڵاو ببونەوە بۆ کۆکردنەوەی (غەنیمە) تاڵانیی شەڕ، بە پەلە و بێ دواکەوتن بگەڕێنەوە.

پاش ئەو سەرکەوتنە مەزنە، شا ئەژدەر، تەواو دڵ خۆش بوو. فەرمانی کرد: ئاگری سەرکەوتن لەسەر هەموو بەرزایەکان بکەنەوە. تا هەموو ناوچەکە ئاگاداری ئەم سەرکەوتنەمان بن. با ڕووناکی ئاگرکە، هەر وەک ئێمە تارکی شەو تێک بشکێنێ.

هەرئەو ئێوارەیە، هەرچەندە سەربازەکان تەواو شەکەت و ماندوبوون، شا ئەژدەر، بڕیاریدا هێرش بکاتە سەر سەربازگەکەی خالید. لە دەربەندی پشتدەر. ئەم بریاڕەی مالکی ئەژدەر، کەمێک لە خۆبایی بوونی پێوەدیار بوو. ڕاستە هەندێ جار ڕق و تورەیی تۆڵەسەندن ،هزر لای مرۆڤی ستەم لێکراو ناهێڵێ. بەڵام نەدەکرا لە شکرێکی ماندووی شەڕ، پێش خۆت بەیت و

شەڕێکی گەورەتری پێ بکەیت و بەگژ سوپایەکدا بچیت کە ژمارەیان چەند بەرابەری سوپاکەت بێت و لە دەشتێکی تەختیش دا.

نیوە شەوبوو، لە شکرەکەی شا ئەژدەر، کە لە ۱۰هەزار سەرباز پێک هاتبوو، بەرەو دەربەنی پشدەر، بەڕێکەوتن. دیاربوو خالید ،ئاگاداری جموجوڵی لەشکرەکەی شا ئەژدەربوو. هەر زوو خۆیان ئامادەکرد و لە زێ پەڕینەوە . هەر بەگەیشتنی سوپاکەی شا ئەژدەر، شەڕ دەستی پێکرد.

خالید، لە لای خۆیەوە زبیری کوری عەوامی لەلای ڕاست و فەزلی کوری عەباسی لەلای چەپ وعبدرحمانی کوری ئەبو بەکری سدیقی لەلای ڕۆژ هەڵات و عبداڵلەی کوری عمری لە ڕۆژئاوا دانا و خۆیشی لەگەڵ زراری کوری ئەزور و باقی سەحابەکان لە پێش سوپاوە ڕاوەستابوون و هانی دەدان بۆشەڕکردن.

هێرش کردن دەستی پێکرد. شا ئەژدەر فەرمانی بەتیرئەندازەکان کرد، هونەری خۆیان بنوێنن. ئەوانیش دەستیان کرد بە تیر هاویشتن. بەجۆرێکی وا تیریان دەهاویشت، کە سوپای عەرەب نەیان دەتوانی یەك هەنگاو بێنە پێشەوە. سوپاکەی خالید، ژمارەیەکی زۆریان لێ کوژرا. بەناچاری و لەژێر زەبری تیر و شمشێری سووارچاکان و قارەمانەکانی کوردا، دەستییان بە کشانەوە کرد.

شا ئەژدەر، هاتە پێشەوە و هاواری کرد: لە وواڵات وەدەریان نێن. هێرش بکەنە سەریان.

لەبەرامبەردا، خالید، فەرمانی کرد: لەدەستی ڕاست، زبیری کوری عەوام و لەدەستی چەپ، فەزلی کوری عەباس هێرش بەرنە سەر تیرئەندازەکان و لە ناویان بەرن. بەو جۆرە، شەڕەکە، شەو و ڕۆژێک بەردەوام بوو.

خالید، لە ئازایەتی و چاونەترسیی مالکی ئەژدەر سەرسام بوو. هەمیشە لە پێش سەربازەکانیەوە دەجەنگا. سڵی لە هیچ نەدەکردەوە . بۆیە، داوای کرد، بەهەر نرخێک بێت دەبێت مالکی ئەژدەر لە ناو ببرێ. دەنا سەرکەوتن ئا ستەمە.

مالکی ئەژدەر، لە ناوجەرگەی شەڕەکەوە نەعرەتەی ئەداو ورەی جەنگاوەرەکانی بەرز دەکردوە. ئە وشەوە ،هەتا ڕۆژی دوایی، دەمەوئێوارە، شەڕ بەردەوام بوو. یەک بست نەمابوو خوێنی لێ نەڕژابێت! لە هەموو جێگەکان شەر بەردەوامی هەبوو. بەهەزارەها لا شەی مرۆڤ کەوتبوو.

خالید، فەرمانی بە فەزلی کوری عەباس کرد، هێرش بکەنەسەری و لەناوی بەرن. فەزلی کوری عەباس، بە سەربازەکانیەوە خۆیان نزیک کردەوە لێی و شا ئەژدەر، زۆر نەبەردانە شەڕی دەکرد .فەزلی کوری عەباس ،فرسەتی لێ هێنا و ڕمێکی بۆ هاویشت. ڕمەکەی، نیشانەکەی پێکا و بەسەختی بریندارى کرد. یەکێکی تریان، گورزێکی دا لە ئەژنۆی و تەواو لە پەلوپۆیان خست. لەئەسپەکەی کەوتە خوارەوە و خوێنێکی زۆری لە بەر دەڕۆشیت. چاوێکی بەرزکردەوە و بەباڵای ئەو جەنگاوە کوردەی بەردەمیدا دەی ڕوانی کە زۆر مەردانە دەجەنگا . لەو کاتەدا جەنگاوەرەکە ئاوری دایەوە. کە بینیی شا ئەژدەر لە سەرەمەرگدایە، بەقەڵەمبازێك، گەیشتە لای و سەری بەرز کردەوە و کردییە سەرباڵی. شا ئەژدەر پێی ووت: چییە کورم؟ بەبینینم بەم شێوەیە، کە لە مەیدانی جەنگدا کەوتوم و خوێنم لە بەر دەڕوات بێتاقەت مەبە. ئێستا، بێ هێزم و چاوەڕێی مەرگ دەکەم. خۆ هێشتا هێزی تفێکم ماوە بیکەم لە سەرچاوەی تاریکیی بێ ئایرویی و بێرەوشتیی عەرەبی موسڵمان. تۆزێک لەقسەکردن وەستا. ئازار زۆری بۆ هێنابوو. لە بەر خۆیەوە ووتی: ئەوەی لە سەر شانم بوو بەرامبەر خەڵکەکەم کردم. ئێستا باکم لەمردن، نیە. تۆڵەی ئەوهەموو قوربانیەم کردەوە. ئێمە ، مێژوویەکی پرلە شانازی و شەرەفمەندانەمان بەخوێنی خۆمان تۆمار کرد. تۆ بڵێیت نەوەکانما ن خۆیان بێ ئاگا بکەن لەم هەمووکارەساتە؟ لەم هەموو نەهامەتی و قوربانیدان و بەرگری کردنانە سڵ بکەنەوە لە باس کردنیان؟ تۆبڵێیت شەرم بکەن لە ناو هێنانمان؟ تۆ بلێی نەوەکانمان شانازی بکەن بە دوژمنانی ئەم وواڵاتەو

پیرۆزیان بکەن؟ نا هەرگیز باوەڕ ناکەم. شا ئەژدەر، بۆ دواجارچاوی هەڵ پری و ڕویکردە زەردەپەر و ووتی: ئەی مەزدا، ئەی سەر چاوەی ڕوناکی، جێگەیەک بۆمن هەیە لەلای تۆ؟

سوپای کورد، هەر کە زانیان مالکی ئەژدەر ڕەوانی پیرۆزی بەنەمری گەشتووە، ورەیان بەرداو دەستیان کرد بە کشانەوە. سوپای عەرەبی موسڵمان، دوایان کەوتن هەتا چیای پشتی دووگۆمان. لەوێوە لەشکرەکەی شا ئەژدەر، ئاوا بوون و لە چاو دیار نەمان.

سەرچاوە

فتوح سواد العراق محمد واقدی وەرگێرانی عبدالعزیزواعظی

طبقات ابن سعد

کوردستان و ئاینی ئیسلام مەلا ڕەوف سەلیم حوێزی

گێرانەوەی بەشێکی ئەو مێژووە لە دەمی خەڵکی ناو چەکە

.

ئەنفالی کوردان لەژێر سێبەری شمشێردا.

بەشی بیست و دوو

دوای بە نەمری گەیشتنی ڕەوانی مالکی ئەژدەر و لە ناوچون و پەرشو بڵاو بونەوەی هێزەکەی بە کێوە کانی ناوچەکەدا ،خوشکێکی مالکی ئەژدەر بە ناوی زێرین توانی زۆربە ئەو هێزانە کۆبکاتەوە ڕیزەکانیان ڕێک بخاتەوەو ئامادەیان بکات بۆ شەڕی پارتیزانی لە دژی سوپای عەرەبی موسڵمان ، ئەوەبو توانی بۆ ماوەیەکی باش بەرگری بکات و زەبری کوشندە بدات لە هێزەکانی خالید کوری وەلید ،بەجۆرێک کە نەی دەهێشت بە ئارامی لە ناوچەکەدا درێژە بە لەشکر کێشیە کەیان بدەن و گوندەکانی ناو چەکە تاڵان بکەن.خاتوو زێرین شەوانە بە خۆی و کۆمەڵێک جەنگاوەری چاو نەترس لە بنکەکەیان لە لەسەر چیای زێرین بوو کە ئەم چیایەش هەر بە ناوی خۆیەوە ناو نرابوو لە وێوە دەهاتنە خوارەوەهێرشی کتو پریان دەکردە سەر سوپای ئیسلام، کوشتارێکی زۆریان لێ دەکردن و دەگەڕانەوە سەرچیا .
هەواڵ گەیشتە خالید کە خوشکەکەی مالکی ئەژدەر سەرکردایەتی هەندێک لە سوپاکەی براکەی دەکات و بۆتە مایەی نیگەرانی بۆ لەشکری ئیسلام لێرەو لەوێ بۆسە بۆ سوپاکەیان دەنێتەوە لێ ناگەڕێت سوپای عەرەبی موسڵمان بێباکانە ئاوایەکان تاڵان بکەن .خالید بە بیستنی ئەم هەواڵە زۆر تورە بو ووتی ئێستا ژنێک وای لێهاتوە بێتە بەربەست لە بەردەم لەشکرەکەم سوێند بە اللە بەزیندوێتی دەست گیری بکەم هەرچی خوا خۆشی ناوێت بەسەری دێنم. یەکێک لە لەوانەی کەشەڕی زێرینیان بینبوو ڕووی کردە خالیدو ووتی ئەمیر خالید ئەم ژنە کورد وەک پیاو شەڕ دەکات و باکی لە مردن نیە بۆ کێ ئەوێرێت سەیری چاوەکانی بکات .خالید داوای کرد کە نامەیەکی هەڕەشە ئامێز بنوسرێت بۆ زێرین دوای لێکردبوو کە خۆی بدات بەدەستەوە چیتر نەبێتە مایەی سەر ئێشە بۆ لەشکری موسڵمانان.هەرلە درێژەی نامەکەیدا ئەرک و ماکی ئافرەتی بۆ دیاری کردبوو بە پێی شەرعی ئیسلام .دەڵێن کاتێ نامەبەر نامەکەی بردوو دایە دەست خاتوو زێرین لە ناوەڕۆکی نامەکە گەشت .سەری سورمابوو لەو یاساو ڕێسایەی کە ئیسلام بۆ خانمانی داناوە.خاتوو زێرین ووتی من ئازادیم لە باو باپیرانەوە و لە سەرو هەمویانەوە لە ئاینی زەردەشتیەوە بۆ بە جێماوە .هیچ کاتێک جیاوازی نە بوە لە نیوان ئێمە و پیاواندا بۆچوون و بریارمان ڕێزی لێ گیراوە.ئێستا ئەم دڕندەیە دەیەوێت خانمی کورد وهەروەک ژنانی خۆیان کەم بایەخ تەماشابکەن .سەری هەڵبڕی سەیری ڕوناکی مۆمەکەی کردو کەمێک تێراما ووتی ئەی مەزدا ئەی سەرچاوەی بوون ئەو مافەی کەتۆ بەئێمەی خانمانت بە خشیوە ئەوان هاتوون بە ناوی تۆوە زەوتی بکەن ئەم

عەرەبانە لە ژێر ناوی تۆدا چ بەد ڕەوشتیەک بەرپادەکەن هەربەناوی تۆوە چوار ژن حەڵالی یەک پیاو دەکەن هەر بەناوی تۆوە ژنی مێرد کوژراو کیژۆڵەی مناڵ لە خۆیان حەڵال دەکەن هەر بەناوی تۆوە دوو خانم بەیەک مرۆڤ تەماشا دەکەن .ئاهورە مەزدا لە تۆ دەپرسم لە یاساو ڕێسای تۆدا کەی جیاوازی لە نێوان ژن وپیاو وبەهێز و لاوازدا کراوە.ئاخر ناکرێت کە پیاو ژن هەردوکیان دروست کراوی تۆن،تۆ بە کەم لە خانم پروانێت بە کەم هزر تەماشای بکەیت .ئەی ئاهورا ئەی سەر چاوەی خۆشەویستی خۆ ئەوەی چاکەکارە خۆشەویتی تۆیە .ئاخر پێم ناڵێی ئەم عەرەبە بەرد پەرستانە بەکەم تەماشاکردنی خانمانیان لە فەرهەنگی ژێر عەبای چ مرۆڤ کوژێکی بیابان نشینەوە هێناوە.ئای کە دەترسم ڕۆژێ بێت کچانی کورد لەماڵ نان و داپۆشین و بەکەم تەماشاکردنیان بە ئازادی خۆی بزانێ ، زۆر دەترسم بێرەوشتی جێی ڕەوشت بگرێتەوەو چوار کچ لە پیاوێک مارە بکەن و ئەمەش بە فەرمانی خوا بزانن من دەزانم ئەم ئایینە دروست کراوی دەستی پیاوە نە خۆشی ژیانی پێیە بۆخانمان نە بە هەشتی پێ ڕەوا دەبینێت . دیارەلە ئایینی عەرەبدا بەهەشت بۆ مرۆڤە دڵ تاریکەکان و شمشێر بە دەستەکان مرۆڤ کوژەکان دەرگای واڵایە،

.ئاهورە مەزدا خۆمن دەزانم کارو کردەوە پێوەرە نەک ڕەگەز ئەی چۆن ئەم گێلە پێی وایە زۆربەی دانیشتوانی دۆزەخ لە خانمانە .بۆیە من سوێند دە خۆم بە ئاهورەمەزدا کە سەر چاوەی خۆشی مرۆڤەکانە هەتا لە ژیاندابم نە هێڵم هەرگیز لە شکۆی ئافرەتی کورد کەم بێت و بێرەوشتی بە ناوی ئایینی عەرەبەوە بە باڵای خانمانی کوردا ببڕێت.

خاتو زێرین ووتی ئەو نەفامە لە ئاستی مندا نیە و هیچ وەڵامێکی نامەکەی نادەمەوە خالید بەمە زۆر تورە بوو .هەستی کرد سوکایەتی پێکراوە . بۆیە زۆر بەتورەیوە ئەم ووتەیەی محمد ووت (لن يفلح قوم ولّوا أمرهم امرأة) واتە ئەونەتەوەی فەرمان ڕەوایان بدەنە دەست ژن سەرکەوتو نابن .وەک دەگێرنەوە ماوەیەکی زۆر خاتوو زێرین توانی ناوچەکە بکات بە دۆزەخ بۆ سوپای عەرەبی موسڵمان . دەڵێن پاش ماوەیەک خاتوزێرین لە ناوچەکەدا نامێنێت .هەندێک کەس پێیان وایە بۆیە خاتوو زێرین ناوچەکەی بەجێهشت لەبەر خۆبە دەستەوە دانی برازاکانی بوو واتە کورەکانی مالکی ئەژدەر بەتەماحی پلەو پایە. . خاتو زێرین بێسەرو شوێن دەبێت هەندێک کەسی ناوچەکە پێیان وایە خاتو زێرین .هەمان زەرنای ئامێدیە لەوێ سەرهەڵدەداتەوە دووبارە لە خەڵکی ناوچەکە سوپا پێک دەهێنتەوە دژایەتی سوپای عەرەبی موسڵمان دەکاتەوە هەر لەوێش ژیانی هاوسەرگیری پێک دەهێنێت لە گەڵ یەکێک لە میرە کوردەکان بەناوی میر پێشەنگ کە فەرمانڕەوایی ناوچەکانی وان وئاراراتی باکووری کوردستان بوو مەرجی هاوسەرگیریەکەیان ئەوە بوە کە هەردوو ناوچەکە بکەن بەیەک بە یەک هێز بە گژ عەرەبی موسڵماندا بچنەوە.ئەوەبوو میرخاتوون زەرپناومیر پێشەنگ لەدوای یەکخستنی هەردوو فەرمانڕەواییەکە بڕیار ئەدەن بەرەنگاری سوپای عەرەبەکان ببنەوە کەئەوبوو لەئاکامدا هەردووکیان لەپاش شەڕوملمڵانێیەکی قورس دژی سوپای عەرەبەکان لەشاخەکانی وان وئارارات لەباکووری کوردستان بەیەکەوە (ڕەوانیان بەدیداری ئاهورەمەزدا شاد دەبێت) وەناوچەی دەسەڵاتەکانیان لەلایەن سوپای عەرەبەکانەوە داگیردەکرێت

لە شکرەکەی خالید، دەوری دووگۆمانیان داو داگیریان کردوو لادێکانی ئەوناوەیان هەموو تاڵان کرد. ناوچەکەیان خستە ژێر دەسەڵات خۆیان. خالید وای بە باشزانی ڕێکەوتن لە گەڵ کوری دوەمی شا ئەژدەردا بکات. بۆ ئەوەی لە ورێگەیەوە بتوانێت دەسەڵاتی خۆی بەسەر ناوچەکەدا بسەپێنێت. خۆشی لا بدات لە شەڕی لابەلای نەوەکانی شا ئەژدەر. هەر بۆیە بە پەلە نامەیەکی نووسی بۆ کورەکانی شا ئەژدەر کە ئەگەر بێت و دەستبەرداری بەرگری ببن و شەڕمان لەگەڵدا نەکەن، ئەوا ئامادەم کە بتانکەم بە سەر لەشکر لە سوپای ئیسلامداو ناوچەکە تان ڕادەستی خۆتان بکەمەوە. ئەوانیش بەو مەرجە ڕازی بوون. کورە گەورەکەیان، کە دواتر ناویان نا بەدر،خالید کچە کە ی خۆی لێ مارەکرد و کردیان بە سەر لەشکر وچووە ڕیزەکانی سوپای ئیسلامەوە. برایمی براشی بە هەمان شێوە. ئەمانە لە چاوی خەڵکی ناوچەکە و نەوەکانی تریدا وەک خۆفرۆشێک تەماشا دەکران. هەر بۆیە، کە سوپای عەرەب لە ناوچەکە دوورکەوتنەوە ئەمانیش نەیانوێرا ئیتر لە ناوچەکەدا بژین و بە خۆیان و خاو خێزانەوە هەڵ هاتن بەرەو بەسرا. ئێستا پێ یان دەڵێن خێڵی بەدر. هەندێکیشیان لێ هاتوون بۆ ناوچەی موسڵ.

خالید، بۆماوەیەک لە ناوچەکەدا مایەوە. هەتاهەموو خەڵکەکەی هێنایە ژێرڕکێفی خۆیەوە. سێ مەرجەکەی ئیسلام، یان کوشتن یان بە جزیە دان یان بە موسڵمان بوون. بەزۆری جزیەیان قبول دەکرد. ئەوەی تواناشی نە بوایە ناچار موسڵمان دەبوو. ئەوانەشی بەهیچ جۆرێک فەرمانڕەوایی ئیسلامییان قبوڵ نەبوو، سەریان دەپڕین.

ئەو ماوەیە کەلە ناوچەکەدابوون هەرچی لادێکانی ئەو ناوە بوو تاڵان کراو دەست بەسەر زەوی و زارە بە پیتەکاندا گیراو خاوەنداری زەویەکان دەدرا بە دەوڵەتی عەرەبی موسڵمان لە مەدینە. دوایی دەدرایەوە بەکرێ بە جوتیاری ناوچەکە و پارەکان کۆدەکرایەوە و دەبرا بۆ بیت والمال. دوایی خەلیفە عومەر، دابەشی دەکرد بەسەر عەرەبی جەزیرەدا.

خالید، هەموو سەر لەشکرەکەی کۆکردەوە و ووتی: ئێستا، ڕوو لە کوێ بکەین؟ کەس ماوە لە ناوچەکەدا بتوانێت بەرەنگارمان بێتەوە؟

یەکێکیان ووتی: بەڵێ! میرێکی زۆر بە هێز ماوە لە پشدەر و زۆر بەهێزە. خاوەنی چەندین قەڵایە و قەڵایەکی گەورەیە هە یە و شورای قەڵاکەی بەسەر زێدا دەڕوانێ. ئێستاش ئەوقەڵایە ماوە و بە قەڵای دینگە بە ناوبانگە.سەربازی زۆری هەیە توانای ڕووبە ڕووبونەوەی هەیە ناوی میر دانیکورە.

سەرچاوە

فتوح سواد العراق محمد واقدی وەرگێرانی عبدالعزیزواعظی

طبقات ابن سعد

کوردستان و ئایینی ئیسلام مەلا ڕەوف سەلیم حوێزی

گێرانەوەی بەشێکی زۆری ئەو مێژووە لە دەمی خەڵکی ناو چەکە ( دەکرا زانیاری زیاترم لەسەر خاتوو زێرین دەست بکەوتایە بەڵام بەداخەوە ئەوانەی زانیاریان هەبوو پا ش٨مانگ لە چاوەڕوانی پەیماندان و پەیمان شکاندن هیچی ترم دەست نەکەوت لێیان. هیوادارم ئەوانەی ئەو زانیاریانەیان هەیە لە گەل خۆیاندا نەی بەنە گلەوە تاچیتر بەشاردنەوەی ئەوکارەساتەی کەبەسەرنەتەوەکەماندا هاتووە خزمەت بە عەرەبی موسڵمان نەکەین.

## ئەنفالی کوردان لەژێر سێبەری شمشێردا.

بەشی : بیست وسێ

)امام واقدی بەیەکەم مێژوونوسی موسڵمان ناسراوە،موسای ابن عقەبەوە زانا بو بە ژیانامەی محەمەد(

امام واقدی ئاوا ئەم مێژووە دەگێرێتەوە موسای ابن عقەبەوە ووتی

واقدی دەڵێت کاتێ خالید لە دووگۆمان بوویەکێک لەو کوردانەی موسڵمان ببو پێی ووت ئەگەر بێتو شا دانیکور بکوژیت و دەست بەسەر قەڵاکەیدا بگریت ئەوا لە ناوچەی پشدەر کەس نامێنت بتوانێت بەرەنگارت بێتەوە لە بەر ئەوەی ئەم میرە زۆر بە هێزە باج و خەراج لە زۆربەی میرە کوردەکان دەسێنێت میر خالید قسەکانی کوردەکەی پەسەند کردو فەرمانی کرد لە دوو گۆمان بار بکەن ڕووەو ناوچەی میر دانیکو.کاتێ گەشتنە ناوچەکە لەسەر گردێک سەربازگەیان دامەزران بەرامبەر قەڵاکەی دانیکور ئەو ناوچەیە چەند گردێکی لێبوو کوردەکانیش هاتنە سەر گردێک و تەماشای عەرەبەکانیان دەکرد لەوە دەچوو هەرگیز مرۆڤی لەو جۆرەیان نە بینی بێت وەک شتێکی سەیر تەماشایان دەکردن لەدورەوە ڕەشو بۆریان دەکردەوە. سوپای عەرەب ئەو

شەوە لەوێ مانەوە بۆ بەیانی ئەمیر خالید نامەیەکی ڕەوانە کرد بۆ میر دانیکور ئەمەش دەقی نامەکەیە
بسم اللە الرحمان الرحیم لەئەمیری سوپای عەرەبی موسڵمانەوە بۆ میری کورد میر دانیکور بۆ هەموو ئەوانەی دژی ئاینی ئیسلامن من سوپاس گوزاری خودایەک دەکەم کە هەر ئەو شایەنی پەرستنە دواکاری ڕەحمت ڕژاندنە بۆ پەیامبەر محمەد.
خودا دینی ئیسلامی ئاشکرا کردوە ئەوانەی پەیرەوی دینی ئیسلام دەکەن لەلای خودا ڕێزیان هەیەو پاداشت وەردەگرن هەرئەو خوایە یارمەتی ئێمەی داوە تا سەرکەوین بە سەر فارس و ئەرمەن و کوردا هەرچی شارو وولاتە بەدەستی ئێمە داگیر کراوە ئەو جەنگاوەرانەی ئازا بوون و ئەزمونی شەڕیان هەبوو هەمویان بە دەستی ئێمە زەلیل کراون کوژراون جا بۆیە ئەم نامەیەم ڕەوانە کرد بۆتان تاڕێگەی ڕێکەوتن بگرنە بەر ئەویش بە مەرج یان ئەوەتا دەبێت واز لە دینی خۆتان بێنن موسڵمان بن یان ئەگەر ئیسلامتان قبوڵ نیە ئەوا دەتوانن لەسەر دینی خۆتان بمێنەوە بەڵام دەبێت جزیە بدەن بەسەر شۆڕی(سەرانە)ئەگەر بەوەش ڕازی نابن ئەوا جەنگتان لەگەڵ دەکەین اللە لە پشتمانە هەمووتان دەکوژین سەرو ماڵتان حەڵاڵی ئێمەیە بۆیە پێت دەڵێم بەسوپاو قلای بەرزو پتەوت لە خۆت بایی مەبە چونکە ئێمە بەهەزارا قەڵا و شورای لەوەی تۆ پتەوترو بەرزترمان گرتوە سوپای فارس و ڕۆمان شکاندوە کە زۆر بە هێتر بوون لە سوپا کەی ئێوە تۆ دەزانی سوپاکەی من لە ژماردن نایە تۆ ناتوانی لە مەیدانی جەنگدا بەو سوپاکەمەو بەرەنگاری سوپای من بیتەوە.والسلام علی من التبع الهدی.لە کۆتایی نامەکەدا ئەم ئایەتە نوسی(انا قد اوحي الینا ان العذاب علی من کذب وقولی)واتەخوا دەڵێ بە پێغەمبەر ئێمە پەیامان بۆ تۆ ناردوە دەردو ناخۆشی بۆ ئەوانە دەنێرین کە تۆ بەدرۆ دەخەنەوە لە ڕاستی وەر ئەگەرێن خالید نامەکی پێچایەوە دای بە کوردێک ووتی برۆ ئەم نامەیە بەرە بۆ میر دانیکور وەڵامەکەیم بۆ بهێنەرەوە.نامەبەرە کەوتە ڕێ هەتا نزیک بۆوە لە سوپای کورد لەوێ تێیان خوڕی کردیان بە هەرا خەریک بوو بیکوژن نامەبەر هاواری کرد من تەنها نامەبەرم لەم عەرەبانەوە نامەم هێناوە بۆ پاشا ئەوسا گرتیان و بردیان بۆ لای میر.لە وێ نامەکەی دایە دەست میر دانیکور،میرکاتێ نامەکەی خوێندەوە سەری ڕاوەشان و ووتی من لە بێشەرمی بێ ئاپروی ئەم عەرەبانە سەرم سوڕماوە هاتوون بەلەشکرێکی گەورەی پرچەکەوە بە بێ پرس هاتوونەتە وولاتەکەم لەدیوی دەرەوەی قەڵاکەم سەربازگەیان هەڵداوە نامەیەکی پرلە هەڕەشەی بەناوی خواکەیان بۆ ناردوم پێم دەڵێت ئێمە بە ناوی خوای گەورەو مهرەبانەوە هاتوین ئاینی ئیسلامان بۆ هێناون ئەگەر قبوڵیش نەکەن ئەوا بە هاوکاری خوا دەتان کوژین و خواکەشمان دەتان خاتە دۆزەخەوە سەروماڵیشمان تاڵان دەکات ،ئاخر مهرەبانی گەورەیی خواکەتان لە کوێدایە هەموو شتێک بە زۆر بڵاو بکرێتەوە دین بە زۆر بڵاو ناکرێتەوە . خۆ ئەم عەرەبانە شتێکی تازەیان نە هێناوە، دزو ڕێگرو پیاوکوژەکانیش هەرهەمان کاردەکەن تاکە جیاوازی ئەمان بەناو و پاڵپشتی خواکەیان بەرۆژی ڕووناک هاتون بۆمرۆڤ کوژی تاڵانی ،دزو پیاوکوژەکانیش بە شەو بە نهێنی خواش هاوبەشیان نیە لە خراپەکاریەکانیاندا.ڕووی کردە ئامادەبوانی دیوە خانەکەی ووتی ئێوە دەڵێن چی واز بێنین لە ئاوێستاو پشت بکەینە لە ئاهورە مەزدا ڕوبکەینە شەڕو تاڵانی اللە کەیان ڕازی بکەین.میر دانیکور ڕووی کردە پیری زەردەشتی ووتی ئەبینم دەنگت نیە تۆ دەڵێی چی ئەویش وەک پیشەی هەمیشەیی لەسەر خۆ لە ژێر لێوەوە ووتی میرم نابێت گومان لەوە بکەین کە سوودو قازانج لە کاری چاک دەکەوێتەوە زیانیش لە گوناهە.هەروەها لەوەی کە ئاهورە مەزد هاوڕێمانە ئەهریمەن دوژمنمانە،لەوەی کە تاکە ڕێگایەکی ئاین هەیە ئەو تاکە ڕێگایەش هی بیری چاک وتەی چاک و کرداری چاکە ڕێگای ئاسمان ڕوناکی پاکیە هی کردگاری بێ کۆتایە کە هەر هەبوە هەر دەشبێت. هەروەها ڕێگایەکی دیکەش هەیە کە هی بیری خراپ و ووتەی خراپ وکرداری خراپە .ڕێگای تاریکی،هی کۆتاداری وئەوپەڕی کلۆڵی ومەرگ و خراپەکاریە کە سەر بە گیانی وێرانکەری نەفرەتی ئەهریمەنە کەجاران لەوگەردوونەدا

نەبووەو هەمدیسان لە دروستکراوەکانی ئاهورەمەزدا دا نابێت ولە کۆتایی دا تێک دەشکێنرێت
.میرم ئەوەی من گوێم لێ بوو لە نامەکەی سەرلەشکری عەرەب ئەمانە سوپای ئەهریمەنن و
هاتون بۆ وێران کاری .کۆڕەکە هەموویان بە جارێ بەدەنگی بەرز ووتیان درود بۆ ئاهورە
مەزدا.پیری زەردەشتی ڕووی کردە نامە بەرەکە ووتی کورم من لە شتێک تێ نە گەشتم لە
نامەکەدا نووسراوە ئەگەرئاییینی ئیسلام پەسەند ناکەن ئەوە جزیە (سەرانە)بدەن لەسەر
ئاییینی خۆتان بمێنەوە!ئەگەرئەم عەرەبانە ڕاست دەکەن وپەیامەکەیان لە اللّە کەیانەوە هاتوە
ئەی بۆ لە پێناوی پارەدا دەست بەرداری پەیامەکەیان دەبن . نامە بەر کەمێک سەری بەرز
کردەوە و ووتی ئەوەی من بیستومە لە ئەمیرەکەیان دەڵێت ئەوپارەیە بۆپاراستن تانە لە
دەستی دووژمن لە سایەی دەوڵەتی ئیسلام.میر دانیکور دایە قاقای پێکەنین کەهەر گیز بەو
جۆرە پێ نەکەنی بوو ووتی گوێتان لێبوو دەمان پارێزن لە دوژمن کام دوژمن ؟مەگەر لەدەست
دڕندەیی خۆیان بمان پارێزن ئێمە لە ماڵی خۆمان دانیشتوی بە بێوەی هیچ کێشەیەکمان نیە
کەسیش داوای لەوان نەکردوە بێن بمان پارێزن لەگە ڵ ئەوەشدا ئێمە ئەوەندە هێزمان هەیە
کە پارێزگاری لە خۆمان بکەین ..میر دانیکور هەناسەیەکی قوڵی هەڵ کێشاو ئاگر لە چاوەکانی
دەباری نامەکەی خالیدی لەت و پەت کردو ووتی ئەمیری عەرەب دەیەوێت من دین وسوپاو
قەڵای خۆم بدەم بەدەستی عەرەبەوە عەرەب بکەم بە گەوری خۆم. بابزانێ ئێمە نە فارسین
نە ڕۆم ئێمە کوردین ئەوەی دوژمنایەتیمان دەکات مەگەر بەسەر لاشەکەماندا بێتە
ووڵاتەکەمانەوە ڕووی کردە نامە بەرەکەو ووتی پرۆ بەو عەرەبە بڵێ من لە ڕۆژی جەنگدا
وەڵامی ئەم نامەیەی ئەو دەدەمەوە.

سەرچاوە
فتوح سواد العراق محمد واقدی وەرگێرانی عبدالعزیزواعظی
طبقات ابن سعد
کوردستان و ئاییینی ئیسلام مەلا ڕەوف سەلیم حوێزی
گێرانەوەی بەشێکی ئەو مێژووە لە دەمی خەڵکی ناو چەکە

ئەنفالی کوردان لەژێر سێبەری شمشێردا.

بەشی بیست و چوار

)امام واقدی بەیەکەم مێژوونوسی موسڵمان ناسراوە،موسای ابن عقەبەوە زانا بو بە ژیانامەی
محەمەد(
امام واقدی ئاوا ئەم مێژووە دەگێرێتەوە موسای ابن عقەبەوە ووتی
واقدی دەڵێت نامەبەرەکەی کە چوو بوو بۆلای میر دانیکور گەرایەوە بۆلای ئەمیرخالید ئەوەی
کەبیستبوی هەمووی بەووردی بۆ گێرایەوە ووتی میر دانیکور ڕازی نیە بەمەرجەکانت ئامادەیە
بۆ شەڕکردن.خالیدی کوری وەلید ووتی دەبێت پیشنیان بدەم ئێمە کێن ،ئێمە خوا سەرمان
دەخات بەسەریاندا .ئیتر بە هۆنراوە کەوتە پیا هەڵدانی خۆی
خالید دلیرە لەناو عەرب دا خالید ڕۆستەمە لە ناو عەجەمدا خالید ئەوە بوولە غەزای شام
کوردی ترساند دلیری بەسام
پاشان ڕوکردە فەرماندەکانی ووتی خۆتان ئامادە بکەن بۆ جەنگ .هەروەها سوپای کوردەکانیش

ئامادەبوون بۆ جەنگ لە مەیدانی جەنگدا هەردوولا ڕیزی شەڕیان بەست هەروەک دوودەریا
تێکەڵ بەیەک بوون بریسکەی شمشێرەکان وەک بریسکە ئاگر وابوون تەپوتۆزوی ژێر پێی
جەنگاوەران وجێ سمی ئەسپەکان بەری ئاسمانی گرت تیر ئەندازە کوردەکان دەستیان کرد
بە تیر هاویشتن لە بەر زۆری تیرەکان سەربازەکانی خالید تەواو ناڕەحت بوون زۆریان لێ کوژرا
پشتیان کردە جەنگ و کەوتنە هە ڵهاتن میر دانیکور کە ئەمەی بینی دوایان کەوت سوپای
عەرەبی موسڵمان کە دور کەوتنەوە لە ناوچەی تیر هاوێژەکان دووبارە هەڵ گەرانەوە لەگەڵ
لەشکری کورد تێکەڵی یەک بوونەوە شەڕدەست پێکردەوە نەعرەتەی جەنگاوەران حیلاندنی
ئەسپەکان فرسەخێک دەڕۆی زۆربەی برینداەکان لە ژێر سمی ئەسپەکاندا گیانیان دەر دەچوو
ئەو مەیدانە ببو گۆمی خوێن ڕەنگی دەموچاو جلو بەرگەکان هەمووی سوری دەکردەوە بۆنی
خوێن مێشکی سەری دەبرد . ئەو ڕۆژە جارێکی تر سوپای عەرەبی موسڵمان لە مەیدانی
جەنگ هەڵهاتن گەڕانەوەسەربازگەکەیان هەروەها سەربازەکانی میردانیکوریش گەڕانەوە ناو
قەڵاکەیان ئەو ڕۆژە زەرەو زیانێکی گەورەیان لە سوپای عەرەبی موسڵمان دا بۆ شەوەکەی
هەردوو لا نۆبەیان دەگرت چاودێری هەڵسوکەوتی یەکتریان دەکرد ئەمیر خالید ئەو شەوە
خەوی لێ نەکەوت لە داخی ئەو شکستەی بەسەر یا هاتبوو هەرپیشی ئەخواردەوە هەرگیز
چاوەڕێی ئەنجامی وا نەبوو بۆ ڕۆژی دوایی ئەمیر خالید بە هەمو سوپاکەیەوە هاتەوە مەیدانی
شەڕو کەوتە نەعرەتە لێ دان و هاواری کرد ئەی یارانی محمەد کەسێک کە مردنی چاکترێت
لە ژیان زۆر حەیفە هەڵ بێت لەبەر ئەو مردنە هەرکەس لە ئێمە بکوژرێت هەر ئەمڕۆ دەبێت بە
میوانی خوا چەند خۆشە لە ڕۆژێکی ئاوا میوانی خوابیت. ووتی ئەی پاڵەوانانی عەرەب
شکاندنی ئێمە شکاندنی ئایینی ئیسلامە جا پێویستە بەدڵ و گیان پارێزگاری لێ بکەین .
هەمووهاواریان لێ بەرز بۆوە کەوتنە اللە اکبر.لە بەرامبەردا بە هەمان شێوە میردانیکور وەک
شێری ناوبێشە بە ئەسپەکەیەوە هەڵ دەسوڕاو هانی جەنگاوەرەکانی دەدا ووتی دوێنی بەچ
دەردێکمان بردن ئەمڕۆش بتان بینم نەیەڵن بە بێوەی دەرباز بن .شەڕ دەستی پێ کرد
میردانیکور لەپێشی لە سوپاکەیەوە هەڵمەتی دەبرد سڵی لە هیچ نەدەکردەو ئەو ڕۆژەش هەتا
ئێوارە شەڕ بەردەوام بوولە کۆتایی ڕۆژدا دوو فەرماندە ی کورد کوژران بە دەستی فەزلی کوری
عەباس مقدادی ئەسوەد. کەتاریک داهات سوپای میر دانیکور کشایەوە بۆ ناو قەلاکەی بەڵام
سەربازە عەرەبەکان لە نزیک قەڵاکە مانەوە کوردەکان قەڵاکەیان پرکردبوو لە خوادەمەنی بیری
ئاویشی تیابوو پێویستیان بە دەرەوە نەبوو دەرگاکانی قەڵاکەیان باش داخست چاودێری ووردی
دەرەوەی قەڵاکەیان کرد. میر دانیکور لە پێش هاتنی سوپای عەرەب نامەی نوسی بوو بۆ
میرەکوردەکان و فارسەکان تا هاوکاری بکەن لەوکاتەدا ئەو سوپاییە کە داوای کردبوو گەشتنە
جێ دەرگا ی ڕۆژ هەڵاتیان بۆکردنەوە کەوتنە پێشوازی کردنیان .سوپای ئیسلام کە چاوی
کەوت بە مە خێرا هێرش یان کردەسەریان شەڕێکی گەورە ڕووی دا سوپای ئیسلام زۆر هەوڵی
دا دەروازەی قە ڵاکە بگرێت بەڵام نەی توانی ژمارەکی زۆر کوژراویان بە جێ هێشت گەڕانە
دواوە لە ترسی تیر ئەندازەکان ،کوردەکانیش چونەوە ناو قەڵاکە ماوەیەک زۆر سوپا ی ئیسلام
گەمارۆی قەڵاکەی دان ڕۆژێک خالید فەزلی کوری عەباس مقدادی ئەسوەد بانگ کرد پێی ووتن
سوپاکە دابەش دەکەم بەسەر سێ بەشدا هەریەک لە ئێوە یەکی بەشێک دەبەن یەکێک تان
با ڕوو لە دەرگای ڕۆژ هەڵات بکات ئەوی ترتان با ڕوو لە دەرگای خۆر ئاوای قەڵاکە بکات لەوێ
خۆتان بشارنەوە بە بە هیچ جۆرێک هەستان پێ نەکەن ئێەش بەرەو ڕوویان دەچین هەر
کەدەرگایان کردەوە هێرشیان کردە سەرمان ئێمە هەڵ دێین کاتێ ئەوان دوامان دەکەون ئێوە
هێرش بەکەنە سەر دەرگاکان ڕێگەی گەڕانەوەیان لێ بگرن .کە ڕۆژبۆوە میر دانیکور دەرگای
قەڵای کردەوە هێرشی کردە سەریان بەچەپو بەڕاست موسڵمانی عەربی دەکوشت
بەهەموولایەکدا هەڵ دەسورا وورەی سەربازەکانی بەرز دەکردەوە تا ڕووی بو بەڕووی مقداد
ئەسوەدەوە بە سەدان جار ڕموو شمشێریان لە یەک دا ، مقداد ئەڵێ من لەسەردەمی

جاهلی ئیسلامداچەندەها شەڕم لەگەڵ پاشایان و پالەوانان کردوە نەم دیوە لە میر دانیکور
ئازاترو چاونەترس تر لەوە دەچوو شەڕ کردن سەیران بێت بۆی.هەتا هەردوکیان تەواو ماندوو بون
میر دانیکور پەلاماری مقدادی دا بیکوژێت بەڵام لەوکاتەدا خالید بەسوپایەکی گەورەوەگەیشتە
فریای ڕزگاری کرد لە دەستی .موسڵمانەکان هەموو هاواریان دەکرد اڵلە اکبر شەڕ گەرم بو
کوردەکانیش بە هەمان شێوە دروديان بۆ خوا ئەکرد .تەقی شمشێرەکان و خڕە خڕەی
زرێپۆشەکان ئەو ڕۆژە ئاوازی مەرگیان دەخوێند بستێ جێگە نەمابوو لاشەی لێ نەکەوتبێت
کوشتنی مرۆڤەکان ئەوەندە هەرزان بوو نرخەکە تەنها پاساوێکی بێماناو هزرێکی شەڕانی
ودەستێکی بە شمشێر بوو .ئەورۆژە فەزلی کوری عەباس وزوبیری کوری عەوام لە بۆسەدا بون
هێرشیان بردە سەر پاسەوانی دەرگاکان توانیان بیان کوژن خۆیان بگەیەنە دەروازەی قەڵاکە بە
جارێ سوپایەکی زۆر ڕژانە ناو قەڵاکە کوردەکان هەموویان کەوتنە ناو میدانی شەڕکە بە ژنو
پیاو مناڵەوە شەڕیان دەکرد ئەمر خالید هاوای دەکردو ورەی دەدا بەسەربازەکانی دەی ووت اڵلە
لە گەڵتانە دەستیان لێ مەپارێزن ئەمانە کافرن سەروماڵیان حەڵاڵی ئێوەیە مقدا هێرشی
کردە سەر ئەو یەکە سەربازیە فارسەی کە هاتبوون بۆ کۆمەک کردنی میردانیکور زۆریان لێ
کوشتن و ئەوەی مایەوە هەڵ هات پشتی کردە شەڕەکە ئەو ڕۆژە هەتا نیوە شەو شەڕ
بەردەوام بوو زۆر بەی جەنگاوەرە کوردەکان کوژران ئەوەی کە مایەوە ڕویان کردە شاخەکان
.بۆرۆژی دواییی سوپای عەرەبی موسڵمان دەستیان کرد بە کۆکردنەوەی غەنیمەی شەڕ تاڵان
کردنی ناوچەکە ، ئەو کەسانەی موسڵمان نابون یان ڕازی نابوون سەرانە بدەن دەکوژران
کورە دەست رەنگینەکان دەکرانە کۆیلە وکچە جوانەکانیش دەکرانە کەنیزە ئەوانەی لە خۆشیان
زیاد بوولە گەڵ بە شەکەی بیت و المال دەبران بۆ بازاری کۆیلە فرۆشتن لەجەزیرەی عەرەبی.
هەرچی کوژرابو لە شەڕەکەدا لەوێ کرانە گۆڕەوە کوردە کوژاوەکانیش دەکرانە گۆری بە
کۆمەڵەوە پێی دەوترا گۆڕی کافرەکان.کەس نەی زانی میر دانیکور چی بەسەر هات هەندێک
دەڵێن لە لادێیەک کەناوی هەڵاوێژەیە کوژراوە عەرەبەکان مزگەوتێکیان لە سەر قەبرەکەی
دروست کردوە بۆئەوەی گۆڕەکەی وون کەن لە خەڵکی ناوچەکە ئەو مزگەوتە ئێستاش ماوە
ناسراوە بە مزگەوتی عبداللە عمران بەناوی (عبداڵلە کوری عمری خەتاب )ناو نراوە کە خۆی
بەژداری ئەو شەڕەی کردوە.هەندێکی تر دەڵێن میر دانیکور نە کوژراوە بە خۆی سوپایەکەوە
هەڵ هاتوە بەرەو ناوچەکانی ڕۆژ هەڵات .
چاوەڕوانی بەشی بیست وپێنج بن
سەرچاوە
فتوح سواد العراق محمد واقدی وەرگێرانی عبدالعزیزواعظی
طبقات ابن سعد
کوردستان و ئایینی ئیسلام مەلا ڕەوف سەلیم حوێزی
گێرانەوەی بەشێکی ئەو مێژووە لە دەمی خەڵکی ناو چەکە

ئەنفالی کوردان لەژێر سێبەری شمشێردا.

یبەشی بیست و پێنج

)امام واقدی بەیەکەم مێژوونوسی موسڵمان ناسراوە،موسای ابن عقەبەوە زانا بو بە ژیانامەی
محەمەد(
دوای گرتنی قەڵاکەی میردانیکور تەواوی ناوچەکە کەوتە ژێر دەستی موسڵمانی عەرەب.ئەمیر

خالید نامەیەکی نووسی بۆ خەلیفە عمری کوڕی خەتاب ئەمەش دەقی نامەکەیە:
بسم اللەالرحمان الرحیم لە خالیدی کوڕی وەلیدەوە بۆ جێنشینی پێغەمبەر عمری کوڕی خەتاب ڕەحمەتی خوا بیارێت بەسەرتانا ،من سوپاس گوزاری خودایەک ئەکەم کە جگە لەو هیچ کەس شایەنی نیە هەروەها ڕەحمەتی خوا بڕژێت بەسەر پێغەمبەرداو هەموو موسڵمانان لە مەکەو مەدینە لەمهاجرو انسار .سوپاس بۆ خودا ناوچەی مرگە و پشدەرو دووگۆمان مان گرتو میرە کوردەکانمان کوشتوە لەشکرەکانیشیانمان تەفرو تونا کردوە خەلکی ناوچەکەشمان گوێ ڕایەڵ کردوە کە نەوێرن بەرەنگارمان بینەوە بەمەرجەکانمان ڕازی بون ئێستا ئاڵای ئیسلام لەم وواڵاتەدا دەشەکێتەوە پەرستگازەردەشتیەکانمان هە موو وێران کردوە مزگەوتەکانمان کرد بەمزگەوتی ئیسلامی.
ڕۆژی نوسنی ئەم نامەیە (یەک شەمە بوو١٢ی ذي القعيدي سال٢١هجری )بوو.
لەپاشان خالید نامەکەی پێچایەوە دایە دەستی زبیری عەوام وفزلی کوڕی عباس وعبدالرحمانی کوڕی ئەبو بەکری سدیق ٥٠ سەربازی دانێ ڕەوانەی کردن تالە سنوری کوردستان دەر چوون بەرەو مەدینە. دوای ئەوان ئەمیر خالید سەربازگەکەی کۆکردەوە کەوتە ڕێ بەرەو دێهاتەکانی کوێستان هە تا گە یشتە دێیەکی گەورە کە کەوتبۆ بەینی دوو کێو لە پشتی ئەودێیە شاخێکی زۆر بەرز هەبوو لە ناو ئەو دێیە باخو باخاتێکی زۆریان هەبوو ئاوێکی سازگاریشی بە ناو دێکەدا دەهاتە خوارەوە ئەو دێیە ناوی هێرۆیە.
واقدی دەڵێت: لەشکرە گەورەوە کە بە ناوچەکەدا ڕەت دەبو پێش ڕەوی سوپاکەمان بە چەند ئاڵایەکی گەورەی ئیسلامەوبوون لەدوورەوە کە خەڵکی دێکە هەرکە چاویان بە ئێمە کەوت بە گەورەو بچوکەوە یەکسەر هێرشیان بۆ هێنایین. بوو بە شەڕێکی گەورە. هەرچەندە خەڵکی گوندی هێرۆ سوپایان نە بوو بەڵام زۆر نەبەردانەو بێ سڵەمینەوە بەگژئەم لەشکرە گەورەیەدا چوون.
پەلاماردانەکەیان زۆ لە ناکاو بوو. توانیان زیانێکی گەورەمان پێ بگەیەنن. بە جۆرێک شەڕیان دەکرد، دەتگووت خۆیان بەخت دەکەن و بە تەمانین جارێکی تر بژین.
گەورەی دێ، کە ناوی گراگر بوو، زۆر ئازاو چاو نەترس بوو. دەهات و دەچوو بە شمشێرێکەوە لە ناوجەرگەی شەڕەکەدا ورەی جەنگاوەرەکانی بەرز دەکردەوە هاواری دەکرد: هۆ خەڵکینە، دەتانەوێت سەرو ماڵ و دینەکەتان ڕادەستی عەرەب بکەن؟ دەتانەوێ کچەکانتان عەرەب مامەڵەیان پێوە بکەن و ئابڕوتان بەرن؟ دەستی خۆتان بوە شێنن هەتا دەتوانن لێیان بکوژن.
شەڕەکە، هەتا دەمەوئێوارە درێژەی کێشا هەتا زراری ئەزوور بەیەکەیەکی سەربازیی تایبەتەوە هێرشی کردەسەرگراگر پاش شەڕێکی زۆرلە پشتەوە زراری ئەزوور ڕمێکی لێدا و لە سنگیەوە دەرچوو گراگری کوشت.
ئەوانەی کە مابوون، لە خەڵکی هێرۆ کە ئەمەیان بینی ورەیان بەرداوهەڵهاتن. سوپای ئیسلام دوایان کەوتن هەتا لە ناو شاخەکاندا بڵاوەیان پێ کردن.
ئەو شەوە کۆمەڵێک دیلیان هێنایە بەردەم خالید ئەویش داوای لێکردن کە موسڵمان بن، ئەوانیش، قبوڵیان نەکرد. خالید، فەرمانی کرد هەموویان سەر ببڕن بۆ ئەوەی ببن بە نموونە بۆخەڵکی ناوچەکە کەچیتر کەس نەوێرت دژایەتی سوپای ئیسلام بکات ئەوەی دژایەتی بکات بە دەردی ئاوایی هێرۆی دەبەین.
سوپاکە، دێکەیان تاڵان کرد و ئەوشەوە هەر لەوێ مانەوە. بۆ ڕۆژی دوایی، هەموو کوژراوەکانیان ناشت. لادێکەیان ڕوخاندو وێرانەیەکیان لەدوای خۆیانەوە بەجێ هێشت. دوایی خالید فەرمانی کرد سەربازەکان خۆیان کۆبکەنەوە ڕوو بکەنە کوێستان.
لەشکرەکە، کەوتنەڕێ. هەتا گەشتنە ناوچەیەکی دەشتایی یەجگار فێنک و خۆش لەوێ دێیەکی بچوکی لێ بوو خەڵکەکەی لە ترسی عەرەبەکان چۆڵیان کردبوو ڕویان کردبووە شاخەکان. خالید فەرمانی دا سەربازگە دامەزرێنن. سێ ڕۆژ لەو جێیە مانەوە تا تەواو ماندوێتیان دەرچوو. خالید نامەیەکی هەڕەشە ئامێزی بۆ خەڵکی سوسینان نوسی و داوای

لێکردن کە موسڵمان بن یان سەرانە بدەن. ئەگەر هیچ کام لەم مەرجانەتان قبوڵ نیە، ئەوا سەرو ماڵتان حەڵالی ئێمەیە.
میری سۆسن کە میری سوسینان بوو کاتی خۆی بە لەشکرێک یارمەتی مالکی ئەژدەری دابوو دژی لەشکرەکەی خالید. بۆیە لە توانای دانەمابوو چیتربەرەنگاری سوپای موسڵمان بێتەوە. ناچار ڕازی بوو بە مەرجەکانیان. خالید بەم هەواڵە، زۆر دڵخۆش بوو. فرمانی بە سەربازەکانی کردم ڕوبکەنە سوسینان و لەوێ سەربازگە هەڵدەن.
سوپاکە هەرگەشتنە ئەوێ گەورەو بچوکی شارەکە لە ترسا هاتن بەرو پیریان. خالید داوای لە گەورەو بچوکی شار کرد پەیمان نەشکێنن و پابەند بن بە مەرجەکانەوە ئەگەر نا وانەیەکتان دادەدەم هەرگیز بیرتان نە چێتەوە. هەروەها دبوایە خەڵکەکە ئەرکی بە خێوکردنی سوپاکەی لەئەستۆبگرتایە. ئالیکیشیان بۆ ئەسپەکانیان دابین بکردایە.
ئەو ما وەیە کە لەشکری عەرەب لە سوسینان بوون ڕێگەی هاتوچۆیان گرت لە نێوان خۆیان و ناوچەکانی ڕۆژ هەڵات تاکەس زانیاری نەبات بۆدوژمنەکانیان دەربارەی سوپاکە یان.
ماوەیک لەوێ مانەوە . خالید، هەواڵی بۆهات کە لەم ناوچەیە دا شارێکی بچوک هەیە ناوی شهبارە میرەکەیان ناوی جاسومە. ڕازی نین موسڵمان ببن. خۆیان ئامادە کردووە بۆشەر.
ئەم شارە بچووکە ئێستاش شوێنەواری ماوە ئێستا پێ دەوترێت دەشتی شوربە و ئەکەوێتە خوارووی شاری سەردەشتی ئێستاوە.
خالید کە ئەمەی بیست یەک دوو جار شمشێرەکەی دەرهێنا لە کێلانەکەی و خستیەوە جێی خۆی و ووتی: شمشێرەکەم، تینوی خوێنە.
سەربازەکانی کۆکردەوە و ڕووی کردە شاری شهبارە بۆ ڕووبە ڕووبونەوەی خەڵکی ئەوشارە.....،،

سەرچاوە
فتوح سواد العراق محمد واقدی وەرگێرانی عبدالعزیزواعظی
طبقات ابن سعد
کوردستان و ئایینی ئیسلام مەلا ڕەوف سەلیم حوێزی
گێرانەوەی بەشێکی ئەو مێژووە لە دەمی خەڵکی ناو چەکە

ئەنفالی کوردان لەژێر سێبەری شمشێردا.

بەشی بیست و شەش

)امام واقدی بەیەکەم مێژوونوسی موسڵمان ناسراوە،موسای ابن عقەبەوە زانا بو بە ژیانامەی محەمەد(
امام واقدی ئاوا ئەم مێژووە دەگێرێتەوە لەموسای ابن عقەبەوە ووتی: ئەو شەوە، خەڵکی شاری شهبار، بە جارێک خرۆشابوون. هەریەکەو بەلایەکدا ڕایان دەکرد و هاواری پیاوان و قیژەی ژنان و کچان و گریانی منداڵان، دەنگی ئەو هەموو ئاژەڵ و پەلەوەرە، بەیەکەوە، دەنگێکی مەترسیداری دروست کردبوو. دەتگوت ماڵئاوایی لە خۆشیەکانی ژیان دەکەن. هەموو کورە گەنجەکان لە دەوری کۆشکەکەی میر جاسومە کۆ ببوونەوە. چاوەڕێی بریاری کۆتایی میربوون.
میر و گەورە پیاوانی شار، لەگەڵ پیاوانی ئایینی کە جێگەیەکی تایبەتیان هەبوو لەلای میر، هەروەها فەرماندە سەربازییەکان، کە هەموویان بەپێوە وەستابوون. دەستیان لەسەر

خەنجەرەکانیان دانابوو. چاوەڕوانی فەرمان بوون.
میر، ووتی: خۆتان باش دەزانن کە لەشکری عەرەب بەڕێوەیە! بمانەوێ یان نەمانەوێ شەڕ دەرگای پێ گرتووین. ئەم عەرەبانە، هاتوون بەناوی دینەوە دەیانەوێت وولاتمان داگیر بکەن و بمانکەن بە ژێردەستەی خۆیان. ئەمەش، هەرگیز قبوڵ ناکرێ. سەروەری خۆمان لە دەست بدەین و دینی باوباپیرانمان بەلاوە بنێن. دەزانن ئەوەی کە کردویانە بە بیانو بۆ ئەم لەشکرکێشیە چیە؟ خوا پەرستنە؟ خۆ ئێمە هەزاران ساڵە خوا دەپەرستین. کەواتە دینەکەیان کردووە بە پاساوێک بۆئەوەی پیرۆزی بدەن بە داگیر کاریەکەیان. ئەرگەرنا، ئەوان خوادەپەرستن و ئێمەش خوا دەپەرستین.
یەکێ لە دانیشتوانی کۆڕەکە، کە پیاوێکی کەمێک بە تەمەن بوو. لەوانە بوو کە دەچوونە بنج و بناوانی هەمووشتێک. هەندێکی لەبارەی دینی ئیسلامەوە بیستبوو. ووتی: میرم. ئەگەر ڕێم پێدەدەی قسەیەکم هەیە.
میر، ووتی: فەرموو قسەی خۆت بکە.
ئەویش کەلەسەر ئەژنۆ دانیشتبوو کەمێک لە جێگەکەی خۆی هاتە پێشەوە و ووتی: میرم، خوای ئەمان و خوای ئێمە یەکێک نیە.
میر، تۆزێک بە سەر سورمانەوە ووتی: ئەوە ووتت چی!
کابرا، ووتی: میرم، وەکو پێم ووتی من لەوەتەی دوو گوێم لێ ڕواوە و پشتێنی پروام بۆ بەستراوە، پیاوانی ئایینی ئامۆژگاریمان دەکەن بەوەی چاکەکار بین و دزی و درۆ نەکەین دوژمنی شەڕ بین ئاگرو ئاو و خاک و هەوا پیس نەکەین. ماڵی کەس نەخۆین. لەبەر هەرهۆیەک بێت کەس نەکوژین. خوێن نەڕێژین. لە بەر ئەوەی ئەمانە لەلایەن خواوە ڕێ پێ نەدراون. بەڵام، وەک بیستومە ئەم عەرەبانە کە خواکەیان ناوی اللە یە، فەرمانیان پێدەکات لە پێناویدا شەڕ بکەن. مرۆڤ بکوژن. سەرو ماڵی ئەوانە بەرن کە لە سەر دینیان نین. میرم، بە خەڵکی سوسینانیان ووتووە ئەگەر ئیسلام قبوڵ بکەن، ئەوا ئێوە دەتوانن لەگەڵمان بێن بۆ شەڕی کافرەکان. لەسەرو ماڵی ئەواندا بەشتان دەبێت. لەبەر ئەوەی ئێوە دەبن بە برای دیینی ئێمە، دەتوانن تا چوارژنیش مارەکەن. ئەمەیان بۆیە پێ وتون بۆ ئەوەی پیاوان بە دینەکەیان ڕازی بن. هەروەها دەڵێن ئەو کەسەی لەسەر دینی ئێمە نەبێت و بکوژرێت ،اڵلەکەشمان وازی لێ ناهێنێ و دەیخاتە دۆزەخێکی گەرمەوە کە پڕە لە ئاگر.
موبیدێک، لەولاوە زۆر توڕەبوو و ووتی: میرم، ئەمانە، بێشک لەشکری ئەهریمەنن. چۆن دۆزەخ بە ئاگری پیرۆز گەرم دەکرێت؟ چۆن دەبێت زەوی بە خوێنی مرۆڤ پیس بکرێت؟ چۆن دزی و تالانی کردن حەلاڵە بەبیانوی دین؟ چۆن خوا بەندەکانی خۆی هان دەدات بۆ شەڕکردن تا پەیامەکەی بڵاو بکەنەوە؟ بۆئەم اڵلەیە هێندە بچووکە داوای لەم عەرەبانە کردووە لەسەری بکەنەوە؟ دینی پاکی ڕاستی، وەک ڕۆژ ڕوناکە. کەی پێویستی بە خوێن ڕشتنە؟ ئاخر چۆن لە پێناوی ناساندنی چاکەدا، خراپە کراوە؟ ئاخر چۆن لە پێناوی هەقدا ناهەقی کراوە؟ ئاخر بەشی هەموو پیاوێک یەك ژنە، چۆن خوا بۆرازی کردنی ئارەزووەکانی پیاو چوار ژنی داناوە؟ من تێناگەم. چۆن دەکرێت خوا لە قسەی خۆی پەشیمان بێتەوە و بۆ ئێمە پەیامێک بنێرێت و بۆ عەرەب پەیامێکی تر؟ یان ئەم اڵلەیە دروست کراوە؟
پیری زەردەشتی کە بە چاوە کزەکانی سەیری چاوی یەک بەیەکی دانیشتوانی کۆڕەکەی دەکرد ووتی رەزدەشتی پەیام بەرمان ڕاستی فەرمووە کە دەڵێت
ئەی ئەهورا مەزدا!
زانیم کە تۆ سەرچاوەی ئارامی و دڵ خۆشیی
تۆ سەرچاوەی ئەقڵی جیهان ئافرێن.
تۆ ئازادی هەڵبژاردنت بە ژنان و پیاوان دا
تا مامۆستای ڕاستەقینەی خۆمان هەڵبژێرین و
خۆمان لەڕێبەری فریوکار دوور بگرین

لەبەر ئەوەی
لەنێوان دوو ڕابەری ڕاستی و درۆین دا،
تەنیا ڕابەری ڕاستی
دروست کارە و زەمین ئاوەدان دەکاتەوە و
پەرە بە بیری پاک دەدات.
ئەی مەزدا،
هیچ کات پەیامبەرێکی فریوکار و کاولکار
ناتوانێ بە دەمامکی ڕاستی و دروستی
پەیامی تۆ بە دیاری بهێنێ.
بۆیە دەبێت ئێمە بەرگری بکەین ورێ نەدەیین بیری خراپ ژیانی خۆمان و نەوەکانمان تاریک بکات
میر، ووتی: وایە. بەدڵنیایەوە هیچ کات پەیامبەرێکی فریوکار و کاولکار ناتوانێ بە دەمامکی ڕاستی و دروستی پەیامی خۆی بە مرۆڤ کوشتن خراپەکاری ڕابگەیەنێت .ئەم اللەیە دروست کراوە،
ناکرێت یەک خوابێت و دوو پەیامی جیاوازی دژ بەیەکی هەبێت! ئێستا ئێمە لەسەر دووڕێیانین. یاخۆمان بدەین بەدەست لەشکری ئەهرمەنەوە، یان ڕێگرتن لە خراپەکاری و بەرگری بکەین لەخاک و وولاتمان..
هەمووان لە جێی خۆیانەوە ووتیان: بە دڵنیایەوە ڕێگرتن لە خراپەکاری.
میر چاسومە، ووتی: داوادەکەم لە هەمووان، ئەوەی دەستی چەک دەگرێت دەبێت بەرگری بکات. ژن و مناڵەکانیش ببەنە جێگەیەك لە دەرەوەی شار، تا پارێزراوبن. لە بەر ئەوەی سوپای عەرەبی موسڵمان دەست لە منداڵی ناو بێشکەش نا پارێزێت.
بۆ ڕۆژی دوایی سوپاکەی میر چاسومە چوونە دەرەوەی شار و لە ئامادە باشیدا بوون بۆ ڕوو بە ڕوو بونەوە. ئەوەندەی پێ نەچوو لەشکرەکەی خالید دەرکەوت لە دوورەوە.
وائیلی ئەسقەفی، لەو بارەیەوە دەگێڕیتەوە و دەڵێت: لەشکری ئیسلام لە نزیک شاری شهبارەوە ویستیان سەربازگە هەڵدەن. بەڵام، کاتێ خەڵکی ئەم شارە ئەمەیان بینی کەوتنە خۆیان. بە هەموو هێزێکیانەوە هێرشیان بۆ هێنایں. پەلاماریان داین. هەردوو سوپا تێکەڵ بوو. شەڕێکی یەجگار گەورە ڕوویدا. سەدای نەعرەتەی جەنگاوەران دەگەیشتە قولایی ئاسمان. سەربازەکانی میرجاسومە، توانیان دەستی خۆیان بوەشێنن. کوشتارێکی زۆربکەن لە سوپای ئیسلام. خالیدی کوری وەلید، بەپەلە کەوتە ڕێک خستنەوەی سوپاکەی و دەستیان کردەوە بە هێرش بردن. میرچاسومە، فەرمانیکرد لەشکرەکەی بەخێرایی پاشە کشە بکەن.
موسڵمانەکان، کە ئەمەیان بینی زۆر دڵ خۆش بوون وایان زانی لەمەیدانی جەنگدا هەڵ هاتوون. بەڵام، کاتێک بە خۆیان زانی تیر ئەندازەکان لە پشتی سوارەکانەوە دەرکەوتن. بەری ئاسمانیان بەتیرەکانیان گرت.
سوپاکەی خالید، مەیدانی جەنگەکەیان بە جێ هێشت و گەڕانەوە دواوە تا لە تیرەکان ڕزگاریان بێت. ئەم جارە، خالید فەرمانی بە سوارەکان کرد، زۆر بەخێرایی هێرش بەرن و تیر ئەندازەکان لەناو بەرن. بەدوای ئەواندا پیادە بڕۆن. بۆ ئەوەی تێکەڵی سوپای کوردبن. کاریگەریی تیرەکانیان لەسەر نەمێنێت. پیلانەکەی سەری گرت و توانیان زۆربەی تیر ئەندازەکان لەناوبەرن.
میر چاسومە، لە پێشی لەشکرەکەی دەجەنگاو ورەی سەربازەکانی بەرز دەکردەوە.
خالید، کە لە دورەوە سەیری شەڕەکەی دەکرد، ووتی: لەم میرە کوردە فێڵ بازترم نە بینیوە.
دەمەو ئێوارە بوو. مقدای ئەسوەد، لە ناو جەرگەی شەڕدا، خۆی گەیاندە میر چاسوم و نەیهێشت دەست بکاتەوە. لە دورەوە ڕمێکی تێگرت و لە ئەسپەکەی کەوتە خوارەوە و لەسەرمەرگدا بوو سەیری ئاوابونی خۆری دەکردو ووتی ئەی ئەهورا مەزدا کاتێ کە تۆم وەک هێزێکی بەدیهێنەر و بەرەو پێش بەر ناسی کە بیری پاک بە سەرم دا باری ، بۆیە ووستم

پارێزەری ئەو ڕێگەیە بم بەڵام دەستی ڕەشی خراپە کاری ڕێگرم بوو وا ئێستا خەڵکەکەمو
وولآتەکەم دەبن بە دیلی دەستی نەزانی.ئەی سەچاوەی هزری ئاوەدانی ودوژمنانی تۆ
واخەریکە جوانیەکان ناشرین دەکەن و ئەقڵەکان پوچەڵ دەکەنەوە ئایا ئەمە بەسەرکەوتنی
ئەهریمەن دەزانرێت یان مل ملانیەکان هەربەردەوامە دەبێت.... دڵ نیام نەوەکانم بەردەوام
دەبن تا ڕووناکی بەم خاکە دەدەنەوە...ئەوسا چاوەکانی بۆیەکجاری لەیەک نا
کاتێ سوپاکەی ئەمەیان بینی بە جارێ ورەیان بەردا و بەڵام شەڕهەربەردەوام بوو. سوپای
عەرەبی موسڵمان،توانیان. زۆریان لێ بەدیل گرتن و زۆریان لێ بکوژن وبڵاوەیان لێکرد.
موسڵمانەکان، کە گەڕانەوە، دیلەکانیان بردە بەردەم خالید. ئە ویش، داوای کرد کە موسڵمان
بن. بەڵام، ئەوان ووتیان واز لە ئاینی باو باپیرانمان ناهێنین بۆ دینی عەرەب.
خالید، فەرمانیکرد هەموویان بکوژن، خۆشی بەدیاریانەوە دانیشت تا ببینێ چۆن خوێنیان لەبەر
دەڕوات. دوایی، خالید، بەسەربازەکانی ووت: برۆنە شهبار و هەرچی تیایە تاڵانی کەن ئەوە
غەنیمەی شەڕە حەلآلی ئێوەیە.

سەرچاوە
فتوح سواد العراق محمد واقدی وەرگێرانی عبدالعزیزواعظی
طبقات ابن سعد
کوردستان و ئایینی ئیسلام مەلا ڕەوف سەلیم حوێزی
گێرانەوەی بەشێکی ئەو مێژووە لە دەمی خەڵکی ناو چەکە

## ئەنفالی کوردان لەژێر سێبەری شمشێردا.

### بەشی بیست و حەوت

ئیمام واقدی، بەیەکەم مێژوونوسی موسڵمان ناسراوە، لەموسای ابن عەقەبەوە کەزانا بوو بە
ژیانامەی محەمەد، ئاوا ئەم مێژووە دەگێڕێتەوە :
وائیلی ئەسقەفی، دەڵێت: شاری شهبار، هەرچی تیا بوو، بوو بە غەنیمەی شەڕو تاڵان کرا.
خەڵکەکەشی ڕەشە کوژ کران. کارێکیان پێکرا لە ناوچەکەدا دەنگی دایەوە. خالید بۆیە ئەمەی
کرد تا خەڵکی ناوچەکە بە بیستنی ئەم کارەساتە بترسێنێ و کەس نە وێرێت لە فەرمانەکانی
ئیسلام دەربچێت.
مەیدانی جەنگەکە هێشتا پڕ بوولە لاشەی کوژراوەکان. خالید، فەرمانی بەکوردەکانی ناوچەکە
کرد، گۆڕهەڵکەنن بۆعەرەبە کوژراوەکان. لاشەکان ئەوەندە زۆر بوون، ڕۆژو نیوێک خەریکی
ناشتنیان بوون. کوژراوە کوردەکانیش، بەناوی گۆڕی کافرەکانەوە دەکرانە چاڵێکی گەورەوە و
هەرچی بەلایدا دەڕۆشت دەبوایە ٧ ( حەوت) بەردی تێ بگرتایە. دەڵێن لاشەی میرجاسومەش
هەر لەناو ئەو گۆڕەدایە کە لە پێناوی ئەوخاک وولآتەدا سەری نایەوە.
خالید، بە خۆی و لە شکرەکەیەوە چوونە ناو شارەکەو بۆ ماوەیەکی زۆر لەوێ مانەوە. لادێکانی
ناوچەکە، کاتێ هەواڵی کوشتاری خەڵکی شهباریان بیست، ترس دایگرتن. بە پەلە کەوتنە
خۆیان و بە ماڵ ومناڵەوە بەرەو شاخەکان هەڵهاتن و هەندێکی تریان لەترسدا نوێنەریان نارد
بۆلای خالید و بە هەموو مەرجێ ڕازی بوون.
واقدی دەڵێت: فەرماندەیەکی عەرەب کە خەڵکی یەمەن بوو و لە شەڕەکاندا ئامادەبوو ئەمەی
گێرایەوە: لە سنوری سوسینان و هیولان ( ئێستا پێی دەڵێن ئالانیان... نوسەر) لە دامێنی
کێوی ئالان، دێیەکی بچووک هەیە ناوی بیژووە. خەڵکی ئەو دێیە کە زانیان عەرەبی موسڵمان
هاتوون و ئەو ناوەیان هەموو داگیر کردووە، ترسان و لە ناو خۆیاندا ڕێککەوتن کەچەند ڕیش

سپیەک بنێرن بۆلای خالید. داوای لێ بکەن کە ڕێگەی ئیسلامیان پیشان بدات بۆئەوەی موسڵمان بن تا دێکەیان لە کوشتن و پرین وتالانی بپارێزن. بەڵام ئەمانە هەرگیزلە دڵەوە موسڵمان نە ببوون. بەهەرحاڵ چەند ڕیش سپیەکی بیژوو بە دیاری بەنرخەوە گەیشتنە لای خالید، لە دێی شوربە. ئیسلام بوونی خۆیان وخەڵکی دێکەیان ڕاگەیاند.
ئەوان، بەخالیدیان ووت: داوا دەکەین چەند سەحابەیەکمان بۆ بنێرن تا ئاینی ئیسلاممان بۆروون بکەنەوە. ئەویش دوو سەحابەی لەگەڵ ناردن. یەکێکیان ناوی بشر بوو و ئەوی تریان ناوی سعد ساعدی بوو .ڕویکردە کوردەکان ووتی ڕق وکینە لەدڵی خۆتان لابەرن. خیانەتیان لێ نەکەن. لەدواییدا بە سەحابەکانەوە گەڕانەوە بۆ دێکەی خۆیان لەوێ هەمووخەڵکەکەیان کۆکردەوە و باسی دینی ئیسلامیان بۆکردن. بەتایبەتی باسی بەهەشت و جەهەندەم و ووتەکانی محمەد.
بەم شێوەیە چوار ڕۆژ قسەیان بۆکردن. بەڵام خەڵکەکە هەرچەندیان کرد نەیان دەتوانی پروا بە دینی ئیسلام بێنن و پێیان قبوڵ نەکرا لە بەر ئەوەی تەواو پێچەوانەی دینەکەی خۆیان بوو. شەوی پێنجەم هەر دووکیانیان کوشت و لاشەکانیان لەسەرانگویلکێك شاردەوە. یەکێکیان ووتی: لە پیسیەوە هاتبوون و کرانەوە ناو پیسی .لە ناو خۆشیانا واڕێکەوتبوون ئەگەر لەشکری ئیسلام هاتە سەریان بڵێن دووسەحابەکە ترساون و هەڵهاتوون و ڕۆشتونەتەوە بۆ ووڵاتی خۆیان.
واقدی دەڵێ: ئەو شەوە عبداڵلەی کوری عومەری کوری خەتاب، خەوی دیبوو بەو دووسەحابەیەوە. لە خەویا، کەوتبوونە ناو دەریاوە و خەریک بوودەخنکان. عبداڵلە، لەخەو ڕاچڵەکی و زۆر خەمبار بوو. چوو بۆلای خالید و خەوەکەی بۆ گێرایەوە. ئەویش ووتی: شکی تێدا نیە خەڵکی بیژوو خیانەتیان کردووە. خالید ووتی: ئەی کوری خەلیفە، پێج سەد سەرباز بەرەو پرۆ. ئەگەر سەحابەکانی لێ نە بوو هەموویان بکوژن. نەهێڵی کەسیان لێ دەربازبێت. من هەرلە سەرەتاوە زانیم ئەمانە لە ترسا موسڵمان بوون. خیانەتمان لێ دەکەن. کە چاوم پێیان کەوت دڵنیا نەبووم لێیان و هەڵسوکەوتیان باش نەدەهاتە بەر چاوم. هەر خۆم زانیم ئەمانە ئاینی خۆیان پێ تەرک ناکرێت. سەد ساڵ باسی ئیسلامیان بۆ بکەیت هەر کە چاویان بە ئاگر کەوت هەموو گیانیان لەخۆشیدا، گڕدەگرێت. پاشان، لە بەر خۆیەوە ووتی: اما لیقضي اڵله امرآ کان مفعولا.
عبداڵلەی کوری عومەر، بە پێج سەد سەربازەوە کەوتەڕێ. چواردەوری ئاوایەکەیان گرت و نەیان هێشت کەس دەربازبێت .خەڵکەکە بەپەلە سران گویلکەکەیان سوتان تا ئاشکرا نەبن.
عبداڵلەی کوری عومەر و چەن سەربازێک چوونە ناو دێکەوە و وتیان: کوا بشرو سعد؟ خەڵکەکە ووتیان: هەڵهاتوون لێرە و نەماون.
عباسی کوری مسلم ووتی، من لەوکاتەدا سەیری سران گویلکم کرد گڕ بەرزدەبۆوە. شکم کرد و بانگی عبداڵلەی کوری عومەرم کرد و پێم ووت: لەوێ شاراونەتەوە. کە شوێنەکەمان هەڵدایەوە، هەردوو لاشەکە دەرکەوتن.
عبداڵلە، فەرمانی کرد هەموویان بکوژن. سەربازەکان، کەوتنە کوشتن و پرینی خەڵکی دێکە و پەنجا کەسیان لێ کوشتن. ئەوانەی مابوونەوە زۆر پاڕانەوە کە وازیان لێ بێنن ئیترعبداڵلە وازی لێ هێنان و ئاگرگەکەیان بۆ ڕوخاندن و هەردوو لاشەی سەحابەکانیان لەجێگایدا، ناشت و مزگەوتێکیان لەسەری دروست کرد وهەتا مزگەوتەکەش تەواو نەبوو نەگەڕایەوە. ( ئێساش ئەو دوو گۆڕە ماوە.... نوسەر).
عبداڵلە کوری عومەرخەتاب خەڵکی دێکەی کۆکردەوە پێی ووتن: ئێوە نەوەی زۆڵن. ئێوە قەومێکی پیسن. بەخوا قەسەم ئەم جارە واز لە دینی ئیسلام بێنن هەمووتان دەکوژم. ئیتر دێکەی بەجێ هێشت و گەڕایەوە بۆ لای خالید. کە هێشتا لە دێیی شوربە نەڕۆیشتبوو و چاوەڕێی قعقاعی کوری عومەری دەکرد.
واقدی دەڵێت: پاش ئەوە، اباعبید، خالیدی نارد بۆ ڕۆژهەڵات و قعقاعی کوری عومەریشی نارد بۆ شارەزوور.

سەرچاوە
فتوح سواد العراق محمد واقدی وەرگێرانی عبدالعزیزواعظی
طبقات ابن سعد

کوردستان و ئایینی ئیسلام مەلا ڕەوف سەلیم حوێزی
گێرانەوەی بەشێکی ئەو مێژووە لە دەمی خەڵکی ناو چەک

نوکتەیەک لەسەر گۆری ئەو دوو سەحابەیەی مزگەوتی بیژوو
دەڵێن چەند ساڵێک لەمەو پێش لە دێی بیژووە لە لای گۆری سەحابەکان دوو کەس دەبێت بە شەڕیان یەکێکیان دیارە خەڵکی دێکی تر دەبێت بەوەی خەڵکی بیژوو دەلێ لە خەڵکی بیژوو ترسنۆکترم نە بینیوە ئەویش لەوەڵامدا دەست بۆ گۆری سەحابەکان ڕادەکێشت و دەڵێت ئەگەر ترسنۆک بوینایە ئەی کێ ئەو دوو شێرەی کوشتوە.

ئەنفالی کوردان لەژێر سێبەری شمشێردا.

بەشی بیست و هەشت

)امام واقدی بەیەکەم مێژوونوسی موسڵمان ناسراوە،موسای ابن عقەبەوە زانا بو بە ژیانامەی محەمەد(
امام واقدی ئاوا ئەم مێژووە دەگێرێتەوە موسای ابن عقەبەوە ووتی
قەعقاعی کوری عمر ووتی شارەزوور ناوچەیەکی زۆر دەوڵەمەندە مەڕوماڵاتێکی زۆریان هەبوو سوپاکەمان لە شەڕەکانی ئەوێ دەستکەوتی باشی هەبوولە (غەنیمە)تاڵانی شەڕ.تونیمان بەزەبرهێز زۆربەی خەڵکەکەی بخەینە ژێردەسەڵاتی دەوڵەتی ئیسلامەوە هەرچەندە خەڵکەکە زوو زوو یاخی دەبونە وەلێمان شەڕیان دەکردەوە لەگەڵمان بەڵام سوپاکەی من چیتر نەی دەتوانی لە ناوچەکەدا بمێنێتەوە لەبەرئەوەی سوپاکەی من هێزکی تایبەت بوو بۆلێدانێکی بە هێزهاتبوو بۆ یارمەتیدانی سوپا سەرەکیەکە کەلەناوچەکەدا خەریکی شەڕ بون بۆیە من بەدەم بانگەوازەکەی ئەمیر خالیدەوە هاتم کاتێ کە دوای یارمەتی لێکردم شارەزوورم بە جێهێشت .
سوپاکەشم ئاوهەوای ئەوناوچەیەی پێ خۆش نەبوو ناوچەکە دووپشکی زۆر بوو چەند سەربازێکم دووپشک کوشتی. قەعقاع کاتێ گەشتە ناوچەی قەڵاچوالان ،هەواڵی بۆهات کە لە قەڵاچوالا ن میرێکی بەهێزی کورد هەیە بۆیە بڕیاری دا هێرش بکاتەسەری .قەعقاع چەند یەکەیەکی سەربازی بڵاوکردبۆوە بە ناوچەکەدا بۆ کۆکردنەوەی تاڵانی لەلادێکانی ناوچەکەدا تا خواردەمەنی و کەلو پەلی پێویست دابین بکات بۆلە شکرەکەی .هەربە گەڕانەوەی ئەوان خۆی ئامادەکرد بۆجەنگەکە لە نزیک شارەکە سەربازگەیان هەڵدا.خەڵکی شار کە ئەمەیان بینی بەجارێ خرۆشان . پشێویەکی وا کەوتە شارەوەهەر مەپرەسە بو هات هاتو هاوار هاوارێ لەترسا ،لەبەرئەوەی خەڵکەکەهەواڵی ناوچەکانی تریان بیستبو کە چیان بەسەر هاتوە بە دەست لەشکرعەرەبی موسڵمانە.خەڵکەکە ڕایان کرد بۆ لای میرەکەیان کە ناوی جاچور بوو لە دەوری کۆبوونەوە چاوەڕێ فەرمانی میریان دەکرد میر ووتی ئەی خەڵکینە ئەوە لەشکری عەرەب هاتوە دەیەوێ وولاتمان داگیربکات وسەروماڵمان تاڵان بکات و دینی باو باپیرانمان لە ناو بەرێت پەرست گاکانمان پروخێنێت ئێوە دەزانن پەلاماری شوێنێکیان دابێت کوران و کچانیانیان دووچاری مە رگ بونەتەوە یان کراون بە کۆلیەو کەنیزە بردویانە لە گەل خۆیانا.خەڵکەکە بوون بە دوو بەشەوە هەندێکیان دەیان ووت با رێک کەوین لە گەڵیاندا سەرانە بدەین(جزیە) باشترە لەوەی سەرو ماڵیش لە دەست بدەین کوران و کچانیشمان بەرن وئابڕوشمان بچێ. هەندێکی تریان دەیان ووت هەروا بە ئاسانی خۆمان بەین بە دەستەوە ببین بەژێر دەستەی عەرەب و

بیان کەین بە گەورەی خۆمان ئاخر لەپێناوی چیدا سەرانە بدەین نان لە دەمی ماڵ ومناڵی خۆمان بگرینەوە مناڵەکانمان برسی بکە ین بۆ ئەوەی ئەوان خۆش گوزەران کەین ،پیاوێک کە لەگەڵ منداڵەکانیا وەستابوو تەواو ورەی بەردابوو لە ترسی ژیانی مناڵەکانی ووتی ئەگەر ڕازی بین بە دینەکەی ئەوان باشتر نیە نە سەرانە ئەدەین نە دەشمان کوژن ماڵو مناڵیشمان پارێزراو دەبێت پیرێکی زەردەشتی کە لەپێشەوە وەستابوو ئاوڕی دایەوە بۆی ووتی کورم دەتەوێت پشت لە ئاهورەمەزدا بکەیت کە سەرتاپا چاکی وروناکیە کەڕێگە نادات بە دزی و درۆ مرۆڤ کوشتن وێرانکاری .کورم لە تەنگانەدا ڕازی بە،لە لێ قەوماندا بە ئارام بە.پروات بەژیان نەبێت بەڵکو پروات بەکاری چاک هەبێت.چونکە کارە چاکەکانی مرۆڤ چاک پارێزەری ئەون. کورم دەبێت سوپاس گوزار بین لەوەی کە بەدبەختیەکان بەسەرلاشەمان دێت نەوەک رۆحمان .هەموتان باش گوێ بگرن لەش دەمرێت ورۆح لەناو ناچێ بۆپاراستنی لەشتان رۆحتان پشت گوێ مەخەن دوای کەسەنێک مەکەون کە بازرگانی بە دینەکەیانەوە دەکەن . میرجاچور ووتی کەواتە ئێمە چی بکەین ڕێ بەین بیرکردنەوەمان پیس بێت و تا لاشەمان پاریزراو بێت ؟ نا من دڵ نیام نەمن نە ئێوەش ئەوە ناکەین رۆحمان بە پیرۆزی دەهێڵینەوە نای کەین بە قوربانی ئارەزووەکانی لەشمان ئێمە ئەمە دەکەین ئەگەر مردینشین با نەوەکانمان بەسەربەرزیەوە ئەم هەڵوێستەمان لەناو لاپەڕەکانی مێژوو بنوسنەوە . ڕوی کردەوە خەڵکەکە و ووتی ئێستا هەڵوێستی ئێوەم دەوێت هەموو هاواریان کرد درود بۆئاهورا ئێمە سەربازی چاکەین بە جارێک گورو تین چوەوە بەبەریاندا خۆیان ئامادەکرد بۆ جەنگ میر جاچور توانی چوار هەزار جەنگاوەر ئامادە بکات بۆ ڕوبەرو بونەوەی عەرەبی موسڵمان بۆرۆژی دوای داوایکردلە سەرلەشکرەکان کە سەربازەکان لە شاروو قەڵاکەی پرۆنەدەرەوە بۆ بەرەنگار بوونەوە، یەکێک لە فەرماندەکان ووتی میرم باشتر نیە لەقەڵاکانمانەوە بەرەنگاریان بینەوە میر تۆزێک تێ ڕاما ووتی ترسنۆکەکان لە پشتی دیوارەکان خۆیان دەشارنەوە بۆشەڕکردن. سەربازەکان بەڕێکەوتن بەرەو دەرەوەی شارو بەرامبەری سوپاکەی قعقاع کوری عمر خێوەتیان هەڵدا. هەردوو لا ریزی جەنگیان بەست بەرامبەر یەک وەستان، قعقاع بەسواری ئەسپەکەیەوە هاتە پێشەوە کەوتە قسە کردن بۆ سەربازەکانی و ووتی ئایا ئێوە نەتان بیستوە کە یاوەورانی محمد چیان بەسەرشامو ئێراق دا هێناوە نەتان بیستوە کە سەعدی کوری وەقاس چی بەسەرکیسرا هێناوە خۆ ئەم کوردانە لەوان زیاتر نین پشت بە اللە سەرو ماڵیان دەبێت بە غەنیمە بۆ موسڵمانان خۆ ئەگەر کوژراین ئەوا شەهیدین جێگەمان بەهەشتە کێ لە ئێوە ئارەزووی دیداری اللە ناکات. لەم قسانە بۆوە هەردوولا دەستیان کرد بە هێرشکردن کوردەکان دەستیان کرد بە تیر هاویشتن کە وەک باران دەباری بەسەرماندا بۆیە دەبوایە سوارەکانمان بە زووترین کات خۆی بگەیاندایەتە تیر ئەندازەکان و لەناویان بەرن بۆئەوەی کاری گەری تیرەکان لە سەرمان کەم بێتەوە بەدوای ئەواندا پیادەکان هێرشیان برد ،بەم جۆرە هەردوو سوپاکە تێکەڵ بون چیتر تیرئەندازەکان نەیان دەتوانی بە کاری خۆیان هەڵسن پیادەکانمان زۆربەیان ڕم بەدەست بوون ڕمەکانیشمان بۆ ئەسپەکانیان مەترسی دار بوو لەسنگی ئەسپەکانمان دەچەقاند کە سوارەکان دەکەوتن یەکسەر دەمان کوشتن هەندێکیان بە قۆچەقانی ڕیزەکانی دواوە سوپاکەیان بەرد باران کردن بە مەش هەندێک لە سوارەکانمان و پیادەکان پەکیان کەوت خراپ بریندار دەبوون چەند جارێک کوردەکان توانیان پاشەکشەمان پێ بکە لەبەر ئەوەی مانەوەمان بەوجۆرە کارێکی باش نەبووکوژراو برینداریێکی زۆرمان هەبووئەمیرقعقاع فەرمانی کرد لەلاوە هێرش بکرێتە سەر چەپو ڕاستی سوپاکەی میر جاچورتا ڕیزەکانیان تێک بدەن بەم پلانە ش توانیان ریزەکانیان تەواو تێک بدەن بیان کەن بە دوو بەشەوە ئاگایان لە بەرەی ناوەڕاست نەمێنێ ئەمەش هەڵەیەکی کوشندە بوو،میر قعقاع هێرشی سەرتا سەری دەست پێکرد سەرنجی لەسەر ناوجەرگەی شەرەکەبوو بۆ لە ناوبردنی سەرکردە سەربازیەکان ،کوردەکان زۆربەیان بە گورز شەڕیان دەکرد کە هیلاک دەبوو لە گورز وەشاندن ئەوسا شمشێرەکانیان لە کێلان بەر دەهێنا شەڕیان پێدەکرد هەندێکیان بە تەورداس

شەڕیان دەکرد، شەڕ بەو جۆرە بەردەوام بووتا ئێوارە کوژراوێکی یەجگار زۆر لە مەیدانەکەدا کەوتبوو لەوکاتەدا ئەمیر قعقاع خۆی گەیاندە میر جاچور پاش شەڕێک دەستو یەخە قعقاع توانی ڕمێک بکات بە سنگیدا بیکوژێت .سەربازەکانی کە زانیان میر کوژراوە هەموویان کشانەوە سوپای ئیسلام دوایان کەوتن زۆریان لێ کوشتن هەندێکیشیان بە دیل گرتن دوایی چونە ناو قەڵاچوالانەوە کە هەرچی تیابوو بوو بە دەسکەوتی شەڕ تاڵان کرا شیوەن و گریان کەوتە ناو شارەوە هەر دەت ووت ڕۆژی حەشرە ئەو هەموو ژنە بێوەژن کران دایکان جەرگیان سوتاو ئەو هەموو مناڵە هەتیوکران هەرچی کچانی جوان وشۆخ وشەنگ بوو بە کەنیزە بران ئاوا دەگێڕنەوە ئەمە بەسەر هاتی خەڵکی بێوەی قەڵا چوالان بوو .

سەرچاوەکان
فتوح سواد العراق محمد واقدی وەرگێرانی عبدالعزیزواعظی
طبقات ابن سعد
کوردستان و ئایینی ئیسلام مەلا ڕەوف سەلیم حوێزی
گێرانەوەی بەشێکی ئەو مێژووە لە دەمی خەڵکی ناو چەک
مێژووی کوردستان ن.لازاریف
مێژووی کوردو کوردستان محمد مەردۆخی

بەشی بیست و نۆ

) امام واقدی بەیەکەم مێژوونوسی موسڵمان ناسراوە،موسای ابن عقەبەوە زانا بو بە ژیانامەی محەمەد(
امام واقدی ئاوا ئەم مێژووە دەگێڕێتەوە موسای ابن عقەبەوە ووتی
پاش چەند ڕۆژێک قعقاعی کوری عمرفەرمانی کرد بە سووپا بە ناوچەکەدا بڵاو ببنەوە دینی ئیسلامیان پێ ڕابگەیەنن ئەگەررازی نەبوون ئەوا داوای سەرانەیان لێ بکەن هەرچی دژایەتی کردن لە ملی بدەن ومالەکەی تالان بکەن ئەوە فەرمانی خوایە .خۆشی لە گەڵ بەشێک لە سوپاکەی بەرێکەوت بەرەو ناوچەی سوێسنایەتی لەوێ چوو بۆ خزمەتی ئەمیر خالید لە شەهاری سوێسنایەتی سەحابان کە چاویان کەوت بە یەکتر دەستیان کرد بە سڵاوات لێدان هەردوو لا چوون بەرەو پیری یەکتر قعقاع چو بۆ خزمەت خالید هەردوو لا بەسەر هاتی خۆیان بۆ یەکتر گێرایەوە ئەو شەوە هەموویان بەیەکە وە مانەوە بۆ بۆ ڕۆژی دوایی پاش نویژی بەیانی خالید سوپاکەی کرد بە چوار بەشەوە ،بە شێکی دا بە زرای ئەزور تا ئەو پێش ڕەوی لەشکرەکە بکات ڕوبکاتە شاری ڕەبت. ڕەبت دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی شاری سەردەشتەوە بەدوای ئەودا بەشێکی تری سووپاکەی دا بە مقداد ئەسوەد کە بە دوای ئەودا پروات بەشی سێیەمی سوپاکەی دابە قعقاع کوری عمر ئەویش بە دوای مقداد دا پروات خۆشی بە باقی سەحابەکانەوە دوایان کەوت سوپاکە ڕوویان کردە ربت زۆربەی ئاوایەکان لە ترسی کوشتارو کاول کاری ناوچەکانی خۆیان چۆڵ کردبوو هەندێکیان ڕوویان کردبوە ئەشکەوتەکان هندێکی تریان ڕوویان لە شارەکان کردبوو تا لە سایەی میرە کوردەکاندا پارێزراو بن هەرچی لە جێی خۆشی مابۆوە یا دەبوو موسڵمان بونایە یان تاڵان بکرانایە.خالید بەو هۆی ئەوگوندانەوە خواردەمەنی سەربازەکان وئالیکی ئەسپەکانی دابین دەکرد بەوجۆرە دەتوانی درێژە بدات بە لەشکرکێشیەکە.
میری ڕەبت ناوی قیروان بوو ماوەیەک لەمەو پێش چوو بوو بۆیارمەتی میر ئەژدەر بەڵام لە مەرگە کوژرا بوولە جێی ئەو میرێکی تریان هەبووکە ناوی میرهورمز بوو کە زۆرلە میر قیروان ئازاترو زاناتر بوو بە هونەرەکانی جەنگ . هەرکە ئاگادار کرایەوە کە سوپای عەرەبی موسڵمان بە ڕێوەیە دەست بە جێ فەرماندەکانی سوپا کەی کۆکردەوە دوای لێکردن کە خۆیان ئامادە

بکەن بۆ شەڕێکی خوێناوی ووتی دەمەوێت بە هەموو توانایەکی خۆتانەوە بەرەنگاری ئەم پەل هاویشتەنەی لەشکری ئیسلام ببنەوە تا زیاتر وولات بەرەو وێران کاری نەبەن هەمووتان سوێند دەدەم بە ڕوناکی پاکی ئاهورە مەزدا کە بۆئەم خاکە بژین بۆ ئەم خاکەش بمرین لە پێناوی پیرۆزیەکاندا سەرمان دانێن. ئێوە دەزانن ئەمە شەڕی مان و نەمانە.سەیرێکی هەموویانی کرد و ووتی ئایا سوێند دەخۆن لە گەڵما بن بۆئەم شەڕ ە.هەموو سەریان دانەواند بە دەنگێکی بەرز بەڵێ میرم هەموومان لە گەڵتاین، میرهەنگاوی هەڵناو هە موو دوای کەوتن بەرەو پەرستگاکە لە وێ کە ژوورێکی کەمێک گەورە لێ بووگوومەزێکی بەسەرەوە بوو کونێکی تیا بوو بۆ دووکەڵ کێش لە ناوەڕاستی ژوورەکەدا ئاگردانێکی لێبووکە ئاگرەکەی لەسەربوو ژوورەکە بۆن خۆشکرابوو بە بۆنی بخورو سوتەمەنیە بۆن خۆشەکان .موبیدێکی بەتەمەنی لێ بووکە کراسێکی خۆڵە مێشی درێژی لەبەردابوو دەمی خۆی هەڵبەستبوولە خزمەتی ئاگرەکەدابوو جار جار ئاگرەکەی بەلقەداری بچوک بچوکی هەنار خۆش دەکرد ئەو ئاگرە کەس نەی دەزانی کە هی چ سەردەمێکەو کەی هەڵکراوە هەندێک دەیان ووت لەو ئاگرەوە هاتوە کە زەردەشتی پەیامبەر بۆیەکەم جار دای گیرساندوە ،کە ئاگری بە هێماونیشانەی یەزدان دەزانی نەک بە خودی خوا خۆی .میرهورمز و فەرماندەکان هەموو دەست و دەمو چاویان شۆردو خۆیان خاوێن کردووەوە دوایی بەشێک لە ئاوێستایان خوێندەوە لەبەر دەمی پەرستگاکەدا کەوشەکانیان داکەندوو چوونە ژوورەوە هەندێک دیاری هەندێک داری سەندەل یان پێشکەش بە موبیدە کە کرد دەستیان کرد بە نزاو پاڕانەوە لە خوا تا سەرکوتوبن بەسەر شەڕخوازان دا. دوایی هەموویا ن سوێندیان خوارد کەپاک و ڕاست گۆبن لەناویەک دا تا دوا هەناسە بەرگری بکەن لە خاک و لەئاینیان موبیدەکە کە گوێی لە سوێند خواردنەکەیان بوو ڕووی تێکردن و ووت ڕۆحی ناپاکی مرۆڤ لەکاتێکدا بەپردی چنوات دەگات،دووچاری ئەشکەنجەو سزادەبێت ولەخانەی درۆزناندا زیندانی دەکرێت. ئێوە کە گەواهی ناکۆکی وجەنگی نێوان ڕاستی ودرۆن، نەکەن واز لە ڕاستی بهێنن و درۆ هەڵ بژێرن. هەموو بەیەکەوە بەڵێنیان دا لایەن گری ڕاستی بن، پاشان ڕووی کردە ئاگرەکەو ووتی ئەم عەرەبانە کە ویژدانیان لە بیرکردوە ڕاسگۆییان لە ژێر پێناوە دوای شەڕوخوێن ڕشتن و ماڵی دنیا کەوتون کە دڵنیام ئەهریمەن ئەوانی فریو داوە .ئەگەر نا کەی ئایین بەزۆر و بە هەڕەشەو بەترس و تۆقاندن بەسەر خەڵکدا سەپێنراوە .سەیرێکی ئامادەبوانی کرد ووتی زەردەشتی پەیامبەرمان بەبێ هیچ گومانێک لەوباوەڕەدابوە هەرکاتێک دەوری ڕۆژگار تەواوبێت ئاهورە مەزدای پیرۆز بەسەر دوژمنی ناپاک و بەد کرداری خۆیدا سەر دەکەوێت ،بۆیە دواتان لێ دەکەم لە لایە نگرانی ئەو بن .پاشان هەموویان پشتاو پشت لە ئاتەشگەکە هاتنە دەرەوەو وەک نەریتێکی ئاینی خواردەمەنیان بەخشیەوە بەسەر هەژاراندا . دوایی میر داوای کرد کە بانگەواز بکرێت بە ناو خەڵکدا خۆیان ئامادادە بکە بۆ ڕوو بە ڕو بوونەوە عەرەبی موسڵمان. بۆ ڕۆژی دوایی سوپا برایە دەرەوەی شاروسەربازگەیان هەڵ دا خۆیان ئامادە کرد بۆ شەڕلە بەرامبەریشدا سوپاکە ئەمیر خالید خێوەتیان هەڵدا ڕیزی جەنگ بەسترا ئەمیر خالید زرێ پۆشە تایبەتەکەی لەبەرکرد کە تیر نەی دەبری بە سواری ئەسپەکەی هاتە پێشی سوپاکەی بە دەنگی بەرز کەوتە قسەکردن و ووتی بتان بینم کوڕانی بیابان نشین ئەمڕۆ مەردایەتی بنوێنن دەستیان لێ مەپارێزن ئەمانە دوژمنی اڵلە کەمانن پڕوا بەدینی ئیسلام ناهێنن اڵلە کەمان فەرمانمان پێ دەکات دەڵێت (قَاتِلُوهُمْ يُعَذِّبْهُمُ اللَّهُ بِأَيْدِيكُمْ وَيُخْزِهِمْ وَيَنصُرْكُمْ عَلَيْهِمْ وَيَشْفِ صُدُورَ قَوْمٍ مُّؤْمِنِينَ )واتە لە گەڵیان بجەنگن خواش بەدەستی ئێوە ئازاریان دەدات و پەستیان دەکات یارمەتی ئێوە ئەدا تازاڵ بن بە سەریاندا،وەدڵ ودەرونی برواداران پاک دەکاتەوە. ئێستا دەتوانم بڵێم ئێمە اڵلە مان لەگەڵ دا یە ئەو ڕێ نیشاندەرمانە هانمان دەدات بۆ شەڕکردن دژی کافرەکان.ئەوەی لەم شەڕەدا شەهید ئەبێت هەرئەمڕۆ دەبێتە میوانی اڵلە لە بەهەشتی هەمیشەیدا حۆرالعینەکان لەباوەش دەگرن وبەیەکەوە مەی دەنۆشن .ئیترچاوەڕێی چی دەکەن هێرش بەرن سەرو ماڵی کوردە کافرە کان و ژنان وکچانی ئەوان وەک کەنیزەو دەسکەوتی شەر حەلاڵی ئێوەیە ،سوپا بەیەک دەنگ کەوتنە اڵلە اکبر. کوردەکان لە بەرامبەریان دەستیان کرد بە

جنێودا بەدزو پیاو کوژ ناویان دەبردن.میر خالید فەرمانی کرد بە زرای ئەزور بە سوپاکەیە هێرش بەرێت لە بەرامبەردا میری ربت فەرمانی کرد بە تیر ئەندازەکان تیربارانیان بکەن ،بەرد هاوێژەکانیش بە قۆچەقانی بەردبارانیانکەن بەمەش ئەسپەکانیان بریندار دەکرد نەیان دەتوانی بەردەوامی بدەن بەهێرشەکە و هەڵ دەهاتن دوابەدوای ئەو ئەمیر خالید فەرمانی کرد بە مقداد ئەسوەد کە دژە هێرش بکات بە خێرایی تێکەڵی لەشکری کوردەکان بێت تا کاری گەری بەردو تیرەکان نە مێنێ .ئەم جۆرە هێرش کردنە خۆبەخت کردن بوو بۆ ئەوەی ڕێگە پاک بکرێتەوە بۆ هێرشی دوای خۆی. هەر کە سوپاکەی مقداد تێکەی سوپای کوردەکان بوو خالید فەرمانی کرد بە قعقاع کوری عمر سوپاکەی بەرێت و هێرشی پاڵ پشتی بکات بەم جۆرە هەردوو سوپاکە وەک دوو دەریا تێکەڵی یەک بوون شەڕێکی وا قەوما ناگێرێتەوە مەیدانی جەنگ پڕببوو لە کوژراو بریندار چەندەها سەرباز چاوی کوێر ببوو دەستی پەریبوو لاقی نەمابوو لاشی جەنگاوەرەکان بەسەریەکدا کو تبوو لە هەموولایەک شەر بەو جۆرە بەردەوام بووهەتا دەمەو ئێوارە ئەمیر خالید کە لە دورەوە چاودێری جەنگەکەی دەکرد بەباشی زانی خۆشی بە سوپاکەیەوە بەژداری بکات بۆ ئەوی گوڕو تینێک بات بە لەشکرەکە بەم هێرشە توانی پاشەکشە بکات بە سوپای کورد زرای کوری ئەزور خۆی بگەیەنێتە میری ربت بەیەک لێدان سەری بپەرێنێت سەری میرهورمز بکات بە نوکی ڕمێکەوە پیشانی سوپاکەی بدات بۆ ئەوەی ورە بەر بدەن بەڵام شەڕ هەر بەردەوام بووتەنها یەک سەرلەشکریش هەڵ نەهات هەموویان جەنگان هەتا دوایەکیان لەو مەیدانە دا کوژران . خالید دوای کرد لە فەرماندەکانی دەستو برد کەن تا پێش تاریک بوون دەست بگرین بەسەر شاری ڕەبت دا هەموو بە جارێک ڕویان کردە شارەکە پەلاماری شارەکەیان دا سەیران کرد کۆڵانەکانی زۆر چۆڵە کەسی دیار نیە خالید فەرمانی کرد شار تاڵان بکرێت ئەوەندەیان زانی لە هەموو ماڵێکەوە ژن و کچ و مناڵ پیاوی پیر بە کوتەک و تەورداس و بەردەوە پەلاماریان داین بەڵام بەرگریە کەیان زۆری نە خایاند لە بەرامبە شمشێرە تیژەکانمان شارمان کرد بە گۆرستان بۆیان .فەرمانم کرد هەرچییان هەیە تاڵانی کەن خانوە کانیشین بروخێنن و بسوتێنن تاکەس خۆی تیایاندا حەشار نەدات بەرگری تیا بکات ئیتر ئەو شەوە دووکەڵ لە هەموولایەکی شار بەرز بۆوە. بۆ ڕۆژی دوایی ئەمیر خالید (غەنیمە)تاڵانیەکانی بەشکرد پێنج یەکی تاڵانیە کەشیان نادر بۆ بیتوالمال لە مەدینە ئەوانەی کە بە دیل گیرابوون کچە جوانەکانیان کرد بە کەنیزە دران بە فەرماندەکان کورە هەرزەکارەکانیش دەکران بە غولام .هەروەها خالید فەرمانی کرد ئاگرگەکەیان وێران کەن ئاگرەکەی خامۆش بکەن هەموو پیاوانی ئاینی بکوژن ولە وجێگەیەدا مزگەوتێک دروست بکەن..

چاوەڕوانی بەشی سی بن

سەرچاوەکان

فتوح سواد العراق محمد واقدی وەرگێرانی عبدالعزیزواعظی
طبقات ابن سعد ە
کوردستان و ئایینی ئیسلام مەلا ڕەوف سەلیم حوێزی
گێرانەوەی بەشێکی ئەو مێژووە لە دەمی خەڵکی ناو چەک
مێژووی کوردو کوردستان محمد مەردۆخی

ئەنفالی کوردان لەژێر سێبەری شمشێردا.

بەشی سی

امام واقدی ئاوا ئەم مێژووە دەگێرێتەوە

خالیدی کوری وەلید ماوەیە ک لە رە بت مایەوە ڕۆژێک یەکێک لەو فەرماندانەی کە بڵاو ببونەوە بە ناوچەکەدا بۆ کۆکردنەوەی غەنیمەو بۆگەیاندنی ئایینی ئیسلام بە خەڵکەکە هاتەوە بە ئەمیر خالیدی ووت من لە خەڵکی ناوچەکەم بیستوە شارێک هەیە ناوی بانە یە، خەڵکی ئەو شارە توانای ڕووبە ڕووبونەوەی لەشکرەکەی ئێمەیان هەیە. ئەمیر خالید کە ئەمەی بیست ڕویکردە هاوەڵەکانی کەوتە ڕاوێژکردن پێ یان لە ئەنجامدا نامەیەکی هەڕەشە ئامێزی نووسی بۆ میری بانە و خەڵکەکەی دوای لێ کردن موسڵمان بن وە ئەگەر نایەوێت مووسڵمان بن دەبێت بەسەرشۆری سەرانە بدەن ئەگەر بە دەم ئەم بانگەوازەوە نایە ن ئەوا خۆتان ئامادەکەن بۆشەڕ کە بە دڵ نیایەوە لە میر هورمزو خەڵکەکەی ڕەبت زیاتر نین.لە کۆتایی نامەکەیدا ئەم فەرموودەیەی محمدی دانابوو وە ئاگادارکردنەوەیەک (أمرت أن أقاتل الناس حتى يشهدوا أن لا إله إلا الله ، وأن محمدا رسول الله ، ويقيموا الصلاة ، ويؤتوا الزكاة ، فإذا فعلوا ذلك ، عصموا مني دماءهم وأموالهم)واتە خوا فەرمانی پێ کردوم کە شەڕبکەم لەگەڵ خەڵک دا هەتا پڕوا بە یک خوا و بە پەیامبەرێتی محمد دەهێنن و نوێژەکانیان دەکەن و وزەکات دەدەن ،ئەگەر ئەوەیان کرد سەروماڵیان پارێزراو دە بێت.)نامەکەی دا بە نامە بەرێک ڕەوانەی کرد بۆ شاری بانە لەوێ چوە لای میرو نامەکەی دایە دەستی ناوەڕۆکی نامەکەشی بۆ ڕوون کردەوە.میر لە پێش دا زۆر تورە بوو دوایی لەگەڵ ئامادەبوانی دیوە خانەکە کەوتنە مشتومڕ یەکێک لە گەورە پیاوان ووتی من وای بە باش دەزانم ڕێکەوین لەگەڵ یان دا. میر ووتی چۆن ڕێک بکەوین ئادەی پێم بڵێ ئەوعەرەبانە سێ مەرجیان بۆ داناوین یان ئەوەتا واز لەدینی باوباپیرانمان بێ نین بۆدینەکەی ئەوان ئەوە نە من نە خەڵکەکەم بەهیچ جۆرێک پێمان قبوڵ ناکرێت، کەنازانین باسی چی دەکات ،تۆ بڵێ دینەکەیان لە (بیری چاک ولە ووتەی چاک ولە کرداری چاک ) زیاتری پێ بێت بۆ ئێمە .هەرگیز پڕواناکەم ئەوەتا بانگ هێشت نامەکەی بە هەرە شەی کوشتنمان دەست پێ دەکات ئەمە ڕووە جوانەکەی دینەکەیانە ئەی ئەبێت ڕوەکەی تری چۆن بێت ؟ فەرماندەیەکی سەربازی کە لە نزیک میرەوە دانیشتبوو ووتی هەڕەشە بە هەڕەشە وەڵام دەدرێتەوە کەس ناتوانێت دینی خۆی بسەپێنێ بەسەرماندا ،میرم فەرمان بکە گیانمان بەخت دەکەین وسەر شۆری قبوڵ ناکەین.ئاسن گەرەکان پشت گیری قسەکانی ئەویان کرد .پیاوێ بە ساڵاچوی کە لە خوارەوە دانیشتبو وەک ڕیش سپی دەم ڕاستی ئاوایەکی دەوروبەر شار هاتبوو، ووتی میرم ئێمە لەوەتەی هەین خواپەرستی خۆمان کردوە نوێژمان کردوە یارمەتی هەژارانمان داوە دەستمان بۆ ماڵی کەس نەبردوە وهەرچی خواپێی خۆش بوە کردومانە هەرگیز گوێتان لە یەکێک بوە داو بێدای بێت بە دەست یاساکانی ئاهورەمەزداوە .وابزانم کەسیش پەنای بۆ ئەم عەرەبانە نەبردوە پێ یان بڵێت وەرن فریامان کەون دینی ئێوەمان دەوێت ئەم عەرەبانە تازە لە بت پرستی ڕزگاریان بوە خوداوەندیان دۆزیوەتەوە وادەزانن ئێمە هێشتا نەمان دۆزیوەتەوە ؟.پیرێکی زەردەشتی کە دانیشتوی کۆرەکەبوو ووتی میرم ئەمە چۆن دەبێت

هەردوولاهەرخوایەکمان هەبێت لە ئاوێستادا بڵێت لەپێناوی من دا ئاشتی بەرقەرار بکەن نەفرەت لە شەڕ بکەن شەڕ کاری ئەهریمەنە، لەلای عەرەب بڵێت لە پێناوی من دا شەڕ بکەن کافرەکان بکوژن ماڵیان بە تاڵان بەرن ئەگەرئەمە ئامۆژگاری خواکەیان بێت ئەی ئەبێت ئامۆژگاری شەیتانەکەیان چۆن بێت؟ میرم پەیامی پەروەردگار پاک و بێ گەردە ڕێ نیشاندەرە بۆ خۆشبەختی مرۆڤ هاتوە.چۆن بە کوشتن کاول کاری وبڵاو دەکرێتەوە ..هەندێک لە بازرگانەکان پێ یان وابوو جزیە بدەن و ببن بە ژێر دەستە باشترە لەوەی دین بگۆڕن یان توشی شەڕو ماڵ وێرانی ئاپروو چون ببن.یەکێکی تر ووتی میرم عەرەبەکان خاوەنی لەشکرێکی گەورەی لەبن نە هاتوون لە توانای ئێمەدا نیە بەرەنگاریان بینەوە باشتروایە رێک کەوین شەڕی خۆ کوژی نەکەین

.ئامادەبویەکی تریان ووتی بابزانین دینەکەیان چی تری تیایە بابەتەواوی لێی تێبگەین ئەوکاتە بڕیار دەدەین ، خۆشەڕەکە لە دەستمان ڕاناکات .ئەوان ئێستا بە هەموو هێزێکیانەوە بەسەر سەرمانەوە وەستاون چاوەڕێی ئەوە دەکەن ئێمە بڵێین نا ئەوان یەکسەر لەملمان بەن هیچ نە بێت با کاتێکمان لەبەر دەم دا بێت بۆ بیر کردنەوە تا بڕیار بدەین .میر هەناسەیەکی قوڵی هەڵ کێشا ووتی بیر لە چی بکەینەوە چیمان بۆ دەرکەوێت لە دینەکە یان ئەوەتا پەیامبەرەکەیان دەڵێت ئەوەی پڕوا بە خۆموو خواکەم نەکات دەبێت بکوژرێت شتەکان وەک ڕۆژ ڕووناکە .بەڵام ڕاست دەکەی ئەگەر بۆ ماوەیەکی کەمیش بێت باشترە ئەم شەڕە لە خۆمان دوور خەینەوە زۆر بەیان ڕازی بوون بەو بڕیارە . میر فەرمانی کرد کە چەند کەسێک بنێرێت بۆلای ئەمیر خالید بە دیاری بەنرخەوە داوای لێ بکەن کە چەند زانایەکیان بە دینی ئیسلامیان بۆ ڕەوانە بکەن تا بزانن ئەم دینە تازەیە فەرمانی بە چیە . بۆ ڕۆژی دوایی نوێنەرەکانی میر کەوتنە ڕێ تاگەشتنە لەشکری عەرەبی موسڵمان لەوێ بردیانن بۆ لای خالید بۆچوونەکانی میری بانە یان پێ ڕاگەیاند خالید کە گوێی لە پێش نیارەکەی میری بانە بوو رازی بوو بە ڕەوانە کردنی بیست سەحابە بۆ بانە تا ئاشنایان کەن بە ئایەتەکان ویاسا و ڕێسای ئیسلام . کاتێ بەرێکردن هەڕەشەیکرد لە نوێنەرەکانی میری بانە کە ژیانی سەحابەکان پارێزراو بێت . دوای ئەوەی خالید دڵنیا بوو لە وەی پێوست ناکات بچێت بۆ بانە سوپاکەی کۆکردەوە ڕوەو باکور بەرەو شاری مەهاباد.

سەرچاوە
فتوح سواد العراق محمد واقدی وەرگێرانی عبدالعزیزواعظی
طبقات ابن سعد
کوردستان و ئایینی ئیسلام مەلا ڕەوف سەلیم حوێزی
گێرانەوەی بەشێکی ئەو مێژووە لە دەمی خەڵکی ناو چەکە

ئەنفالی کوردان لەژێر سێبەری شمشێردا.

بەشی سی و یەک

لەدوای داگیرکردنی کوردستان لەلایەن عەرەبی موسڵمانەوە پرۆسەی بەعەرەبکردنی کوردستان دەستی پێ کرد خەلیفەکان یەک لەدوای یەک دەستیان کرد بە نێشەجێکردنی عەرەب لە کوردستاندا

یەکێک لە دەرهاویشتە و ئەنجامەکانی پرۆسەی داگیرکردنی کوردستان و هەموو هەرێمەکانی ڕۆژ هەڵات و ڕۆژئاوا ئەوەبوو کە خەڵکێکی زۆر لە خێڵ و تیرە و بنەماڵە عەرەبەکان بەتاک و بە کۆمەڵ،نەخاسمە لەوانەی بە شەڕکەر وجەنگاوە دادەنران بە شارو گوندو چیاو دەشت و کەژی کوردستاندا بڵاو بوونەوەو هێدی هێدی نیشتەجێ دەبوون، هۆکارو پاساوی ئەم دیاردەیە بەرلە هەموو شتێک ئەوە بوو ئەوشوێنەی کە عەرەبی موسڵمان داگیریان دەکرد بە موڵکی شەرعی خۆیان دەزانی دەخرانە ڕیزی دەستکەوتەکانی جەنگەوە بەتایبەت ئەو شارو دەڤەرانەی بە شەڕوو بە نوکی ڕم داگیردەکران و خەڵکە بەرگریکارەکە ئەوەی لە کوشتین و دیلی دەربازبوایە شاربەدەر دەکران.
ئەو زەوی و زارانەی وا زەوت دەکران،پتر خاکی بە پیت و بەراو بوون لە ڕەزو باخ و بێستان پێکدەهاتن، عەرەبەکان دانیشتوانە ڕەسەنەکایان بە سەپان دەگرت و بە زۆر کاریان پێدەکردن مو

چەکەشیان نانە سک بووواتە ژیانێکی کولەمەرگی بوو.فەقیهو شەرع زانەکان ئەحکام و یاسا و ڕێسای بەگەڕخستنی ئەم مڵک و زەویو زارانەیان داناوە بە دەستکەوتێکی حەڵاڵ رەوایان هەژمار کردوە سەبارەت بەزەویە دەستبەسەرداگیراوەکان.الامام أبو حنيفەالنعمان(م١٥٠-٧٦٧ز) وسفيان الثوری(م١٦٢ك-٧٧٩ز)القاضی ابو یەسف (م١٨١ك-٧٩٧ز) وای دەبینن ئەوزەویانەی کە بە شەڕ کەوتونەتە دەست موسڵمانەکان ئەگەر ئیمام لەکاتی خۆیدا دابەشی کردبێت بەسەر ئەوانەی دەستیان بەسەرداگرتوە .ئەوا دەبنە زەوی دەیەکی-الاراضی العشریە- واتە خاوەنە تازەکانیان کە عەرەبە داگیرکەرەکان بوون دەیەک دەدەنە دەوڵەت و خاوەنە ڕەسەنەکانیشیان دەبوونە سەپان و کۆیلەی زەوی -الرقیق-
وەئەگەر ئیمام ئەوزویانەی دابەش نەکردبیت و نەیگەڕاندبێتەوە بۆ موسڵمانان، ئەوا خەڵکەکە دەبوایە سەرانەو موڵکانە بدەن بە دەوڵەت-الاراضی الخراجیە-بێ ئەوەی بکرێتە کۆیلە.
نیشتەجێکردنی عەرەبەکان بۆ ئەوەش بوو پرۆسەی داگیرکاری ڕانەوەستێت تا بکرێت درێژەی پێبدرێت دەوڵەتی ئیسلامی دەیتوانی لەم ڕێگایەوە و بەم شێوازە پێی خۆی قایم تر بکات و دەسەڵاتی بچەسپێنێت. فەرماندە گشتیەکان و سەرلەشکرە مەیدانیەکان،هەرشارو ناوچەیەکیان بگرتایە هەڵدەستان بەبەرنامە هەرچی مڵکی بەپیت و کێڵگە و ڕەزوباخ هەیە بە خزم و کەسوکارو لایەنگرانیان دەبەخشی،خەلیفە کانیش ئەم کارەیان لاپەسەند بوو پشتگیریان لێدەکرد. معاویەی کوری ابو سفیان بە فەرمانی خەلیفە عوسمان هۆزی تمیم و قیس والاسدی لە ناوچەی جەزیرەی باکوری کوردستان نیشتەجێکرد.هاوکات عیاض یش ژمارەیەک عەرەبی لە شەنگار جێگیر کرد و هرثمە بن عرفجە ش نەخشەی موسڵی کێشا و مڵکی بەسەر هۆزە عەرەبەکاندا دابەش کرد.هەروەها جەریربن عبداللە لەگەڵ گرتنی حلواندا بنەماڵەی خۆی و خزمەکانی تیادا نیشتەجێکرد.کثیربن شهاب الحارثی ماوەیەک کرا بەوالی ماسبزان ومیهرەگانکدک و حلوان و نەهاوەندو دینەوەر بە ئارەزوی خۆی زەوی و زاری کوردەکانی بەسەر کەسوکارەکەی خۆیدا دابەش دەکردهەتا کوری نەوە کانی لە ماسبزان موڵکیان هەبوو. بنەماڵەی الخشارمە لە هۆزی الاسد بنەمالەیەکی تریان دانیشتوی ماسبزان بوون.عوسمان الاودی ومرەبن ابی مرە الردینی العجلی موڵکو عەقاراتیان هەبوو لە ئازەربیجان و چیاکان .بەو جۆرە کۆچی عەرەب بەردەوام بوو بۆکوردستان تا دەهات شارەکانی حلوان ،سیروان ،سێمەڕە،کرماشان،دینەوەر .عەرەب ببو بە پیکهاتەیەکی دیاری شارەکان.
پرۆسەی دەست بەسەرداگرتن و بە عەرەب کردن هەڵەت و چیاو کێو زۆرگەکانیشی گرتەوە،ناوچەی شاخاوییەکانی سێگۆشەی نێوان ،شارەزوور ،هەولێر، ئازەربیجان ناونرا السلق بەواتای کانیاو بەراو ئەمانە بوون بەموڵکی بنەماڵەی الحسن بن السباح لەهۆزی همدان، دوایی بو بە موڵکی . معاویە الاودی.خەلیفەکانیش لە تالانی زەویزاری کوردستان پشکیان هەبوو .نەریز شارۆچکەیەکی کوردی بوو کەسایەتیە عەرەبەکان چاویان تێ ڕیبوو مورە بن عمر و الطائی ئەوشارۆچکەیەی کردە جێنشینی خۆی کورەکەی علی بن مورە کۆشک و بازاڕی تایا بنیات نا،شنۆ چەن شارێکی تری ئازەر بیجان مڵکی بنو الردینی عەرەب بوو و هەر بەناوی ئەوانەوە دەناسرا.ئدریس بن معقل العجلی لەسەردەمی ئەمەویەکاندا بە خێڵەکەیەوە لە چیاکان نیشتەجێبوون. جەزیرەی بۆتان لە کۆنترین جێگەی نیشتە جێبوونی کوردە لەسەرەتای سەدەی ئیسلامی بە دورگەی کوردان ناسرابووتا کابرایەک عەرەب بەناوی عبدالعزیز بن عمرلە ناوەڕاستی سەدەی٣ک-٩زهاتە جەزیرەی بۆتان و هەندێک خانووی لێ بنیاتناو لەو ڕۆژەوە بە جەزیرەیا بن عمر ناسرا. ناوی هەندێک شار کە بەعەرەبی کرا لەوانە(
بەغوداد=بەغداد)(هەلوان =حەلوان)(گولاڵە=جەلەولا) (هۆزان =ئەهواز)،(مێشان ،میسان)،(دورگەی کوردان= جەزیرە)(گۆت =کوت)(ئامەد=دیار بەکر)و تکریت و دەینور و موسل)
لەوکاتەوە هەتا ئەمرۆ پرۆسەی داگیرکردن و بە عەرەب کردنی کوردستان بەردەوامە.هەرجارەو لەژێر ناوێک.
سەرچاوەکان

کوردوکوردستان لە ڕۆژگاری خیلافەی ئیسلامیا
فتوح البلدان لاپەرە ٤٣٣
فتوح البلدان لاپەرە١٨٢،یاقوت الحموی معجم البلدان ٤/١٩٥
فتوح البلدان لاپەرە٣٢٧
فتوح البلدان لاپەرە٣٠٥،٢٩٩-٣٠٧، ٤/٦١
فتوح البلدان لاپەرە٣٢٢معجم البلدان٣/٥٩
فتوح البلدان لاپەرە٣٢٥-٣٢٦ مختصرالبلدان لاپەرە٢٦٢
فتوح البلدان لاپەرە٣٢٦
نقشەبەندی،ئازەربیجان لاپەڕە٨٤-١٠٧
مروجالزهب ٣/٤٧٤ -٤٧٥.وفیات الاعیان٤/٧٣ ،الصدفی،تحفە زوی الاباب لاپەرە٢٢٣-٢٢٦
ابن خردازابە المسالک والمالک لاپەرە ٣٢،ابن رستە،الاعلاق النفیسە لاپەڕە١٥١،کتاب البلدان لاپەرە٤٠،الاصطخری،المسالک و المامالک لاپەڕە١١٥،ابن حقول،صورە الارض لاپەرە٣٠٦، معجم البلدان٢/٤٦٩/٦١

## ئەنفالی کوردان لەژێر سێبەری شمشێردا.

بەشی سی و دوو

واقدی دەڵێت ئەو جەنگاوەرە کوردو فارسانەی لە شەڕەکاندا هەڵ هاتبوون هەموویان ڕویان لە شاری ورمێ کردبوو بۆیە لەو شارە سوپایەکی بێ شومار کۆببونەوە .
میری ئەم شارە ناوی خۆش قەدەم بو، کاتێک ئەمیر خالید ناوچەی مەهابادی داگیرکرد، ئەمیرێکی عەرەبی بۆدانان، بۆ بەرێوبردنی شارەکە، پاش ماوەیەک فەرمانی کرد بە هاوەڵەکانی کە خۆیان کۆبکەنەوەو ڕوبکەنە ورمێ، ئەوانیش سەربازگەکەیان کۆکردەوەو کەوتنە ڕێ بۆ ورمێ، لە سنوری شارەکە سەربازگەیان هەڵدا.
کاتێ میری ورمێ ئەم هەواڵەی بیست، فەرمانی کرد کە هەموو سوپاکەی کۆببنەوە، پاشان بەتورەیەوە کەوتە قسەکردن بۆیان، ووتی ئەی سەربازە ئازاکانی کورد فارس، وەک خۆتان دەزانن ئەم ژیانە جێگای مرۆڤی بەدکردارو بەدڕەفتارو پیاو خراپانە، ئەم ژیانە زۆر چاپوک سوارو پاڵەوانانی فەوتاندوە، ئێوە ئەزانن کە ئێمە شەرەف و ناموسمان بەدەست عەرەبەوەیە، لە جێگە ئێمە عەرەب لەووڵاتە کەمان دەژی، خاکی ووڵاتمان بە دەست ئەوانەوەیە، بوون بەفەرمان ڕەوامان، سەرومالّ یان بردوین، ژن و منالّەکانمان دیلە دەستی ئەوانن، لە ووڵاتی باو باپیرانمان کەمێک نە بێت بە دەستمانەوە نەماوە، دەزانن ئێوە لە خەوی غەفلەتن، بەخەبەر وەرن، فرسەت لەدەست خۆتان مەدەن، بە درۆ دەلەسەکانیان هەڵ مەخلەتێن، کەمێک وەستاو دووبارە کەوتەوە قسەکردن، ووتی ژیان کاتێ خۆشە کە مرۆڤ لەسەر خاکی نیشتمانی خۆی بە ئازادی بژی، من مردنم بەلاوە خۆشترە لە ژیانی ژێر دەستی و کۆیلایەتی، دوایی میر دەرگای خەزێنەکەی کردەوە، سوپاکەی خەلاّت کرد و هەموویانی ئامادەی جەنگ کرد، ڕۆشتنە دەرەوەی شار بەرامبەر سوپای عەرەبی موسڵمان سەربازگەیان هەڵ داو پیاوانی ئاینی زەردەشتی هاتن و خواردن و خواردەمەنیان بەسەرهەژاراندا بەخشیەوە تاگەشتنە پێشی

سوپاکەیان، لەوێ و چەندەها ئاگریان کردەوە پیرێک (گەورەپیاوی ئاینی زەردەشتی) هاتە پێشەوە ووتی هەرچی دەڵێم لە دوامە وە بیڵێنەوە سوپاش بە دوایا وبەدەنگێکی بەرز ئەمەیان ئەوتەوە (من ڕای دەگەیەنم کە پەیرەویکاری ئاینی چاکی ئۆهرەمەزد پەرستانم وهیچ گومانم لەبارەی ئەو ئاسوودەییە جەستەیی وگیانیە نی یە کە لەگەڵ خۆی دەیهێنێت نەک لە بەر ژیانێکی خۆش یان تەمەنێکی درێژ، هەروا نەک لەبەر ئەوەی کەدەزانم پێویستە هۆشم لەگەڵ لەشم تەباو هاوبەش بێت. من هەرگیز لەوئاینە چاکەی ئۆهرەمەزدپەرستان هەڵناگەڕێمەوە هیچ گومانم لێی نیە. من نەڕێزلە ئایینی عەرەب دەگرم و نە پەسەندی دەکەم نە پرواشیان پێ دەهێنم .(
کە لە سوێن خواردن بوونەوە پیری زەردەشتی ڕوی کردە سوپاکەی عەرەبی موسڵمان وتی کردارتان ڕاستی دینەکەتان دەردەخات کردار پێوەرە، ئێوە شەڕەنگێزن و لەشکری ئەهریمەنن، میر خۆش قەدەم هاتە پێشەوە ووتی ئەمڕۆ سینەی ئێمە بەرام بەر بەعەرەب ئاگری لێ بەرز دەبێتەوە، ئەبێت ئەمڕۆ ئێمە تۆڵەی ئەو هەموو بێ تاوانانەیان لێ بکەینەوە. دڵنیابن ئەگەر ئێمە لەم شەڕەدا بشکێن ئەوا سەری خۆمان وماڵ و منداڵمان بەدەستی عەرەبی موسڵمانەوە دەبێت .
لە پاشان میر فەرمانی کرد هێرش بەرن لە بەرامبەردا سوپای عەرەبی موسڵمان هێرشیان هێنا دەستیان کرد بە الله و اکبر خالید هاواری کرد وتی لەمردن مەترسن، ئێوە بەهەشتین، الله یاوەرتانە، هەردوو سوپا تێکەڵ بوون، تۆزو خۆڵی میدانی جەنگ بەری ئاسمانی گرت بوو، یەکەیەکی سوپای کوردان لە دواوە دەهۆڵیان دەکوتا شەرەکەیان گەرم دەکرد، بریقەی شمشێرەکان وەک ڕۆژ دنیای ڕوناک دەکرد، ئەو ڕۆژە مەرگ وەک باران دەباری، بە سەرسەربازەکاندا لە گەرمەی جەنگدا بوو میری مازەندەران بە خۆی و لەشکرێکەوە هات، بۆ هاوکاری میری ورمێ، سوپای عەرەب ترسیان لێنیشت، دەستیان کرد بە پاشەکشە کردن .
ئەمیر خالید ووتی بەکەمی خۆتان و زۆری ئەوان دڵ تەنگ مەبن، ورەتان نەڕوخێ، ئێوە ئەم ئایەتەی الله تان نەبیستوە کە دەڵێت زۆرجار کۆمەڵی کەم سەر دەکەون بەسەرکۆمەڵێکی زۆردا بە پشتی خوا .
ئەوڕۆژە سوپای ئیسلام کوژراوێکی زۆریان دا، زیاتر بەرگریان دەکرد تا هێرش بردن، بەڵام پاش نیوەڕۆ ئەمیر خالید یارمەتی پێگەشت لە ابا عبیدی عامری جرا، سوپایەکی بۆناردبوو بە سەرۆکایەتی نجم کوری مفرق، سوپای عەرەبی موسڵمان هەر کە چاویان پێیان کەوت کەوتنە لا الە الا الله، زۆر دڵ خۆش بوون، ئەو ڕۆژە هەتا تاریک داهات شەڕ بەردەوام بوو، دوایی هەردوولا کشانەوە بۆ سەر بازگەکانیان .
بۆ ڕۆژی دوایی خالید هێرشی کردە سەر سوپای کوردەکان، شەڕگەرم بوو ئەوەندە لاشە کەوتبو دەبوایە سەربازەکان بە سەر لاشەکاندا هەنگاویان بنایە، هاوارو ناڵەی برینداراەکانیش گوێی کەڕدەکرد، ئەوەندە خوێن ڕێژرا بوو ئەوناوە سوری دەکردەوە .
ڕەنگی جلووبەرگ سەربازەکان دیار نەمابوو لە بەر سوری خوێن هەر ئەت ووت ڕۆژی حەشرە، کەس ئاگای لە کەس نەمابوو، کە سەیری چاوی جەنگاوەرەکانت دەکرد تەنها یەک شتت بەدی دەکرد، ئەویش بەڕقەوە پێ دەووتی هەموو کەسێک دەکوژم، بۆ ئەوەی خۆم بژیم .
شەڕ بەو جۆرە بەردەوام بوو هەتا ئێوارە، لە کاتێکدا جەنگاوەرەکان بە خەنجەر لە گەردنی یەکتریان دەداو خوێن دەڕێژرا، ئەنەسی کوری مالک پەلاماری میر خۆش قەدەمی داو کوشتی، کاتێک سوپاکەی ئەمەیان بینی هەموویان هەڵهاتن، سوپای عەرەب دوایان کەوتن بڵاوەیان پێکردن، دوایی سوپاکەی خالید گەڕانەوە دەستیان گرت بەسەر شاری ورمێ داو هەموویان تاڵان کردو پیاوانی ئایینیان هەموو کوشت، هەموو پەرستگاکانیا ڕوخاند، کردیانن بە مزگەوت دوایی خالید هەمووسەر لەشکرەکانی بە ناوچەکەدا بڵاو کردەوە بۆ ڕوبە روبونەوە، بە ڵام کەس نە بوو بتوانێت بەرەنگاری سوپای ئیسلام بێتەوە .

میر خالید نامەیەکی نووسی بۆ خەلیفە عمری کوری خەتاب، باسی سەرکەوتنەکانی خۆی بۆکردبوو، هەروەها هەرچی دەست کەوتبوو لەو شەڕانەدا لە دەست کەوتی شەڕ پێنج یەکی بۆنارد خەلیفەکە زۆر دڵ خۆش بوو بە سەرکەوتنەکنیان ودەست کەوتەکانیان کە جێنەمابوو تێی کەن لە بەر زۆری دەست کەوتەکان. هەتا سواڵ کەرەکانیش موچەیان بۆ برابۆوە لە لایەن خەلیفە عومەرەوە .
چاوەڕوانی  کۆتایی بن
سەرچاوە
فتوح سواد العراق محمد واقدی وەرگێرانی عبدالعزیزواعظی
طبقات ابن سعد
کوردستان و ئایینی ئیسلام مەلا ڕەوف سەلیم حوێزی
ابن سلام :الاموال٢٤٨ـ٢٤٩
ابو یوسف الخراج ل٤٤
البلاذري فتوح١٤٤
گێرانەوەی بەشێکی ئەو مێژووە لە دەمی خەڵکی ناو چەکە

ئەنفالی کوردان لەژێر سێبەری شمشێردا.

بەشی سی و سێ

بەشی کۆتایی

امام واقدی ئاوا ئەم مێژووە دەگێڕێتەوە
ئەمیر خالید ماوەیەک لە ورمێ مایەوە لەو ماوەیەدا بۆهەموو ناوچەیەک ئەمیرێکی دانا کوردستانی کرد بەشێک لە دەوڵەتی عەرەبی موسڵمان .فەرماندە سەربازیە عەرەبەکان بەفەرمی بوون بە فەرمان ڕەوا لە کوردستان دا. لە هەموو جێگەیەک خەڵکەکە دەبوایە پەرستگا زەردەشیەکانیان بروخانایە لە جێگەکەیدا مزگەوتیان دروست بکردایە .ڕۆژێک هەواڵیان بۆ ئەمیر خالید هێناو ووتیا خەڵکی بانە هەرکە لەشکری موسڵمان دورکەوتونەتەوە هەر بیست سەحابەکەیان کوشتوەو لە دینی ئیسلام پەشیمان بونەتەوە. خالید بە بیستنی ئەم هەواڵە زۆر تورە بوو ووتی شەرت بێت وانە یەکتان دابەمر پشتاو پشت بی گێرنەوە تاکەس نەوێری جارێکی تر لێمان هەڵ گەڕێتەوە.خەڵکی شارەکە ووتیان کاتێ ئەو بیست سەحابەیە هاتنە شارەکەمان حسابیان بۆ کەس نە دەکرد خۆیان بە گەورە پیشان دەداو ئێمە بەکەم،سوکایەتیان دەکرد بە دینەکەمان، خۆیان لێ ببو بە فەرمان ڕەوای شارەکە،ئێمەش ئەوەمان پێ قبوڵ نەکرا لەناومان بردن،ئێمە دەمان وویست بزانین دینەکەیان باسی چی دەکات نەک بێن و فەرمان بکەن بەسەرماندا،(ئێستا بانەیەکان بە ئەسحابە کوژ ناسراون). بۆ ڕۆژی دوایی خالید سوپاکەی کرد بە دوو بەشەوە بەشێکی لە گەڵ خۆی بردو بەشێکەی تری بۆ ئەنەسی کوری مالک بەجێشت هەروەها کردی بە فەرمان ڕەوای ناوچەکە ئەنەسی کوری مالک لەوێ مایەوە هەتا مرد ئێستاش گۆرەکەی لەوێ یە. ئەمیر خالید ڕووی کردە شاری بانە بە سوپایەکی زەبەلاحەوە دوور لە هەموو داب و نەریتێکی شەڕلە نیوە شەودا پەلاماری شارەکەیان دا ئەمیر

خالید فەرمانی کرد کە دەست نە پارێزن ڕەشەکوژیان بکەن ووتی نامەوێت هەتا منالّی ناو بێشکەش بە بێوەی لە دەستمان دەرچێت.عبداڵلەی عمری ختاب وقعقاعی عمرو تەمیمی ومقدادی اسود کندی وزراری ئەزور هەر یەکەی بەلایەکدا هێرشیان دەبرد بانەییەکان دەکوشت .خەڵکی شارەکە بە هەموو جۆرێک بە گژ سوپای عەرەبی موسڵماندا چونەوە کۆڵانەکانی شار پڕ ببوو لە لاشەی پیاو و ژن و منالّ لە هەموو جێگەیەک ئاگر بەرز دەبۆوەو ماڵە کانیان دەڕوخان بەسەر لاشەکاندا خالید ووتی دەمەوێت کارێکیان پێ بکرێت لە ناوچەکەدا دەنگ باتەوە ئەو ڕۆژە هەتا ئێوارە شەڕ بەردەوام هێدی هێدی ووشە کوردیەکان چیتر نە دەبیسترا زمانی کوردی تەواو نامۆ ببو بە شارەکە. سوپای عەرەب شارەکەیان کرد بە گۆڕستانێکی گەورە بەرگری تیانەما. پێش تاریک بوون کۆمەڵێک دیلیان هێنایە بەردەمی خالید ئەویش فەرمانی کرد هەموویان بکوژن .ماوەیەک لەبانە مایەوە دوایی میر خالید فەرمانی کرد سەربازگەکە کۆ بکەنەوە خۆیان ئامادە بکەن بۆ گەڕانەوە. لە شکرەکە بە ڕەبت دا بەرەو عەرەبستان گەڕایەوە بەڵام لە گەڕانەوە دا بە دوو گۆماندا تێ پەڕی ولەوێوە بەڕێکەوتن تاگەشتە نزیک دێی سما قولی لەوێ لە شکرێک لە شەقلاوەوە لە گەڵ خەڵکی داخ لەدڵی ناوچەکە لە سماقولی یەکیان گرت بۆ تۆڵە کردنەوە لە عەرەبی موسڵمان بۆیە هەر زوو لە ناو دارەکان و لە پشتی گابەردەکان بۆ سەیان بۆ دانابوون هەر کە لەشکرەکە کەوتە بۆسەکەیانەوە کوردەکان لە هەموو لایەکەوە تیر بارانیان کردن تیر بارانەکە بە جۆرێک بوو لەشکرەکەی لە پەل و پۆ خست دوایی بوو بە شەڕێکی گەورە دەستەو یەخە بە سەدان لاشەی عەرەبی موسڵمان لە مەیدانەکەدا کەوت کوردەکان کە زانیان تۆڵەی خۆیان کردۆتەوە هەڵ هاتن شوێنەکەیان چۆڵ کرد. لەو شەڕەدا زۆر بەی فەرماندەکان کوژران لەوانە وقعقاعی عمرو تەمیمی ومقدادی اسود کندی وزراری کوری ئەزور و وائیلی ئەسقەفی کۆمەڵێکی زۆر لە ناودارانی سەحابەکان.ئەمیر خالید وعبداڵله عمر زۆر گریان بۆ سەحابەکان کەوتنە دوعاکردن لە خەڵکی سما قولی پاشان هەموکوژراوە کانیان هەر لە وێدا ناشت کە ئێستا ناسراوە بە دۆڵی ئەسەحابان .دەڵێن لەو شەڕەدا کوردەکان ۳۰هەزار عەرەبی موسڵمانیان کوشت و،هەروەها ۱۰هەزارکوردیش ڕەوانیان بە دیداری ئاهورەمەزدا شاد بوو بەڵام بە داخەوە پاش پرۆسەیەکی دوورودرێژو ۱٤۰۰ساڵەیی بە عەرەب کردنی هزری کورد لە ژێر ناوی دیندی ئیسلام دائێستا بەرد دەگیرێتە مەزاری کوردەکان لە ژێر ناوی گۆرە کافردا ، گۆری عەرەبەکانیش بە چاودەپارێزرێن وئەو دزو پیاو کوژانەمان لێکراون بە فریشتە. ئەمیر خالید نامەیەکی نوسی بۆ فەرماندەکان ئاگاراری کردنەوە کە هەرگیز بروا بە موسڵمان بونی کورد نەکەن ئەمانە هەڵیان خڵەتان دوین ئاگاتان لە خۆتان بێت ئەمانە وەک دڕندە وان بۆشەڕ کردن . کاتێ نامەکە گەشتە دەست سەرداران زۆر گریان بۆ سەحابەکان.پاشان ئەمیر خالید و عبداڵله عمر ناوچەکەیان بە جێ هێشت بە خەمو خەفەتێکی زۆرەوە لە بەینی هەولێرو موسل توشی چەمێک بوون لە سە ئەم ڕوبارە پیرەژنێک دانیشتبوو لێیان پرسی تۆ چی دەکەی لێرە دانیشتووی پیرە ژن ووتی من موسڵمانم ئەمەوێت لەو ئاوە بپەڕمەوە بەڵام ناوێرم، عبد اللّهعمر پیرەژنی خستە پاشوی خۆی چوە ناو ئاوەکە خالید ووتی ناترسی شتێکت لێ بکا عبد اللّهعمر ووتی نا کێشە نیە هەتا بە ئەسپەکەوە چونە قوڵایی ئاوەکە پیرەژنەکە چەقۆیەکی گەورەی دەرهێنا لە باخەڵی کردی بەسەر دڵی عبد اللّهعمر لەوکاتەدا ئەمیر خالید ئاوری دایەوە بۆ دواوە بینی عبد اللّهعمر ڕەنگی زەرد بوە هاواری کرد بۆوا تێک چوی چی ڕوی یاوە .ووتی فریام کەوە پیرەژن کوشتمی ئەبوایە بەقسەی تۆ بکردایە ئەمیر خالید گەڕایەوە عبد اللّهعمر لە ئاوەکە هێنایە دەرەوە یەک شیری یا لە پیرژنەکەو کوشتی فرێی دایەوە ناو ئاوەکە (دەڵێن کوری ئەوپیرەژنە بەدەستی عەرەب کوژرابوو هاتبوو بۆ تۆڵە کردنەوە)دوایی چوە بۆلای عبداڵله عمرکە لە سەرە مەرگدا بوو بە خالیدی ووت سەلامم بگەیەنە بە باوکم خەلفیەی موسڵمانان عمری کوری خەتاب کاتێک لە وەسێت بۆوە گیانی دەرچوو مرد.کەرلە نزیک ئاوەکە ناشتیان ئێستا گۆرەکەی بە سوڵتان عبداڵله عەرەبی ناسراوە

.عبدڵلە عمر زیاتر لە ١١مزگەوتی لە کوردستاندا بەناوی خۆیەوە ناو ناوە. پاشان ئەمیر خالید
ناوچەکەی بە جێ هێشت تاگەشتە شاری حمس لە وێ مایەوە تا کۆتایی ساڵی بیست
ویەکی هجری پاشان کۆچی دوایی کرد.(شەڕی کوردو عەرەب موسڵمان هەتا سەردەمی
عەباسیەکان بەردەوام بوو (
سەرچاوە
فتوح سواد العراق محمد واقدی وەرگێرانی عبدالعزیزواعظی
طبقات ابن سعد
کوردستان و ئاینی ئیسلام مەلا ڕەوف سەلیم حوێزی
گێرانەوەی بەشێکی ئەو مێژووە لە دەمی خەڵکی ناو چەکە.